



# ئابووری کوردستانی باشوور

## لێکۆڵینەوەیەکی ئابووری یە لەسەر هەرێمی کوردستانی عیراق

خەسرەو پیربالْ



کوردستان ٢٠٠٢

"ئێستا کاتی ئاوەدانکردنەوەی کوردستانە

ئەی میللەتی کورد: ئێستا کات و دەمی کارکردنە، کاتی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و دامەزراندنی پیشەسازی و دروستکردنی هونەرە، بەم شێوەیە، ئێمە دەتوانین خزمەتی میللەتی خۆمان بکەین و ، ژیان لە وڵاتی خۆماندا خۆش بکەین".

بارزانی نەمر

لە ١ی تەمووزی ١٩٧٠

کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان

كتێب: ئابووری هەرێمی كوردستانی عیراق

لێكۆڵینەوەیەكی ئابووری یە لەسەر هەرێمی كوردستانی باشوور

نووسەر : خەسرەو پیربال

وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە :ئیسماعیل خەلیل ئیسماعیل

پێداچوونەوەی زمانەوانی: مامۆستا كەریم محمود شێخانی

پیت چنین : نووسینگەی صباح – هەولێر

چاپی یەكەم: كوردستان– هەولێر ٢٠٠٢

ژمارەی سپاردن: ٥٢١ / وەزارەتی رۆشنبیری و هونەر هەرێمی كوردستان

# پێشەکی وەرگێڕ

لە ڕاستیدا لێکۆڵینەوە لە بارەی هەموو بواری چالاکی و بابەتەکانی سەردەمی کوردستان و دەست نیشان کردنی خاڵە لاواز و سست و گەشە دارەکان و دارشتنی پرۆگرامێکی زانستی ڕێك و پێك بۆ چارەسەر و بنبڕکردنی هەڵە و کەم و کوڕیەکان زۆر پێویستی بە پەلەی ئێستا و ئایندەی کوردستانەو زۆر پێویستە کە لایەنە پەیوەندیدارەکانیش لەو پێناوە دا هەوڵ و کۆششێکی زۆر بدەن بۆ برەو سەندن و بەر فراوانکردن و گەشەسەندنی بواری لێکۆڵینەوەی زانستی بە پێی پرۆگرامێکی داڕێژراو، بە تایبەتی لە بواری ئابوری و دارایی، پیشەسازی داهێنان کشتوکاڵ،ئاودێری، وزە، سامەنەکانی کوردستان و چۆنیەتی باش بەکار هێنانیان لە لایەن حکومەتەوە هەروەها لە بواری کۆمەلایەتیش لە بواری کێشەکانی لاوان و پیران و ئافرەت و منداڵان و کارکردنی منداڵان و زۆر بە ووردی و گرنگی ڕەچاو بکرێت.

هەروەها یارمەتی و هانی لاوان بدەن کە نامەکانییان بکەنە مەبەستی ئەو مەیدانە.

نامەی ماستەری کاك خەسرە و پیربال. کە لە زانکۆی فنلەندا پێشکەشی کردوە لە ژێر ناوی (کورتە باسێکی ئابوری کوردستانی عیراق) لە ماوەی ئەم دە ساڵەی تەمەنی ڕابردوی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دوای شەڕی کەنداو پاش ڕاپەڕین،لە کاتی خۆیدا پەرتووکە ئینگلیزییەکەم هەڵەچن کردو هەر لەسەر داوای بەڕێزیشیان وەرم گێڕایە سەر زمانی کوردی . بابەتێکی زۆر گرنگ و بە پێزە ,چونکە ناو براو ئامازەی کردوە بۆهەموو بوارەکانی ئابووری و چالاکییەکان و سامانە گرنگەکانی کوردستانی،جگە لە بوارەکانی داب و نەریتی بازرگانی و هۆیەکانی پەیوەندی بازرگانی و پێش کەوتنی بازرگانی و پێش کەوتنی ئەو پەیوەندیانەو بواری ئابوریو ئاوەدانکردنەوە کە لە خانەی وێرانیەوە دەستی پێ کردەوە، هەروەها ئامازەی بە خاڵە سپیە پرشنگدارەکان و خاڵە ڕەش و سست و لاوازەکانیشی داوە، بوێرانە چارەسەری زانستێشی بۆ بنبڕکردن و دوبارە نەبونەوەی ئەو کەم و کوڕیانە، زۆر بە دڵسۆزانە دەستنیشان کردوە.

هەروەها لەسەر هەمو بوارەکانی ژیانی میللەتی کورد و پێش کەوتنی بواری ئاوەدانکردنەوە و بوژاندنەوەی کوردستان لە هەموو ڕویەکەوە،ڕۆڵی ڕێکخراوە نێو نەتەوەییە حکومیو ناحکومی و

ڕێکخراوە ناوخۆیەکان و هاریکاریان لە نێوان خۆیانداو لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان لەم پێناوەدا خستۆتە ڕوو .

پێشەکیە بەنرخەکەی پرۆفیسۆری زانکۆی ئەمەریکا دکتۆرە(کارۆڵ ئۆلاری)باشترین هەڵسەنگاندن و نرخاندنە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە .

من بە پێویستی ئەزانم ئەوەش بلێم، کە لێکۆڵینەوەکە زۆر ڕووی پرشنگدار و ڕوناکی بواری هاوکاری حکومەتی هەرێم و پارتی وجەماوەر و حزبە جیا جیاکانی کوردستان بە هەموو ڕەگەز و نەتەوەکانیانەوە لەپێناو پێشکەوتنی کوردستان و باش کردنی باری گوزەران و سەقامگیری دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئاسایش و ئارامی وولات زۆر بە ووردی و بێ پشو خەباتیان کردوە لە پێناو پاراستنی ئەم ئەزمونە پیرۆزەمان، جگە لە دەرخستنی ڕۆڵی پرۆگرامی نەوت بەرامبەر بە خۆراك و داهاتەکەی ،زۆر شایەنی شادی و گەشبینیە کە لاوانی کوردستان بەم شێوەیە بە تەنگ وولاتەکەیانەوە بێن.

دووبارە پڕ بە دڵ دەستخۆشی لە کاك خەسرەو پیربال و هاوتاکانی ئەکەم ئاواتم ئەوەیە کە لاوانی کوردستان لە هەر شوێنێك بن دوور یان نزیك لە هەر کۆمەڵ و گروپێك بن لە هەر نەتەوەو ڕەگەز و ئاینێك بن هەرگیزاو هەرگیز ئەوە لە بیر نەکەن کە گەلەکانی کوردستان هەموو پێکەوە لە کوردستان، کیمیا باران، ئەنفال ,کۆڕەویان دی پاش بەکار هێنانی هەموو چەکە کۆ کوژە قەدەغە کراوەکان و هەموو کارێکی وێرانکاری و کوشتن و بڕین لە دژیان بەگشتی، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ لە ژێر سێبەری ئالای ئازادی کوردستان و کابینەی چوار، پێویستە بە هەموو توانا و هۆش و هەستەوە پێنووسەکان وەگەڕ بخەین لە پێناو ئاوەدانکردنەوە و بوژاندنەوەی کوردستان بۆ پێشەوە چوونی وولاتەکەمان بۆ ئاستی وولاتانی پێش کەوتوو بەبەردەوامی ئەویش بە پێی پرۆگرامێکی تۆکمە و داڕێژراو.

وەرگێر

اسماعیل خلیل هەژار

هەولێر: ٢٠٠٢/٨/٢٥

# پێشەكی

لە لایان خاتوو پرۆفیسۆر كارۆڵ ئۆلرێ نووسراوە .

لە ماوەیی دە ساڵی ڕابوردوودا حكومەتی هەرێمی كوردستان،هەوڵ و تەقەلایەكی زۆری داوە بۆ وەدی هێنانی كۆمەڵگایەكی شارستانی یەكگرتووی بەختەوەر ,وە دامەزراندنی بنكە دیموكراسییەكان، وە ئەمەش بۆ یەكەم جارە لە مێژووی عێراقدا .

ئەم گۆڕانكارییانەش كە لە بوارەكانی دیموكراسی و ئابووری و داراییدا لە كوردستانی عێراقدا ڕووی دا، لە ماوەیەكی زۆر كورتدا هاتە ئەنجام و بەرهەم، بە بەراورد كردن لەگەڵ مێژووی دوورو درێژی فەرمانڕەوایی حكومەتی عێراق .

لەگەڵ ئەوەشدا، كە ئەو گۆڕانكارییانە زۆر پوختە و كاریگەربوون ,لە ماوەیەكی زۆر زوو هاتنە دی بەلاّم، كارامەیی و بەرهەمەكانی زۆر سروشتی بوون، كە هەروەك خەڵكی كوردستانی عێراق، بیانەوێ ئەم دە ساڵەی پاش ڕاپەڕینیان تەرخانكردوە بۆ چەسپاندنی توانا و لێهاتویی خۆیان، بۆ هەموو هاوولاّتییانی عێراق و خەڵكی دەور و بەری ناوچەكە و جیهان .

بواری نائاسایی ناوچەكە و كۆمەڵگای جیهانی، ئاستەنگەكانی سانسۆر كردنی سەربەستی و مافەكانی ، هەڕەشەو گوڕەشەی مەترسیی بەردەوام و یاسا بەزاندن و سەرپێچیكردنی ، هەموو ئەوانە بەربەستێكی كاریگەر بوون دژ بە یەكەم هەڵهێنانی هەنگاو بەرەو دیموكراسی و كۆمەڵگایەكی شارستانی و ئابوورییەكی دروست و ڕەوا لە ناوچەكەدا.

بەڕێز خەسرەو پیربال لە لێكۆڵینەوەكەیدا ، بە ڕاستی و ڕاشكاوی بەرەو گەشە سەندنی بوارەكانی : ئابووری ، ڕۆشنبیری و ڕامیاری كوردستانی عیراقی لە ماوەی ئەم دەساڵەی ڕابوردوودا هەر لە ساڵی ١٩٩١ ەوە خستۆتە ڕوو.

لێكۆڵینەوەكەی، سەرچاوەیەكی گرنگە كەڵك و كاریگەرییەكی چاكی هەیە بۆ یارمەتی خوێندكارانی بیانی ، ڕامیارمەندان ( سیاسەتمەداران ) وە هەروەها دەستەو كارمەندانی بازرگانی.

لێکۆڵینـەوەو تۆژینەوەکـەی بـەڕێزیان لـەبارەی کاریگـەری و سـوودمەندیی پرۆگرامـی (نـەوت — بەرامبەر خۆراك)، کە بە پێی بڕیاری نێونەتـەوەیی ژمـارە ٩٨٦ (UN/SCR/986) هاتـە کایـەوە لـە ناوچەکەدا بە تێرو تەسەلی ڕوونی کردۆتـەوە، کـارێکی گـرنگ و سـوودمەندی بـە خـەڵکی ناوچـەکە بەخشیوە هەروەها پیێ داگرتنی لەسەر ئەوەی ، کە پێویستە لەسەر ئەمەریکاو سەرجەم ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو نەتەوەیی کاتی وتووێـژ لـەبارەی چاکسـازی ئـەو بەرنامەیـە بـە تـەواوی، پشتگیری تەواوی ئەوە بکەن ، کە پێویستە هەرێمی کوردستانی عـیراق، بـە بـەردەوامی (١٣٪ ) ی داهاتی نەوتی عیراق لە بەرنامـەی سـزا زیرەکـەکان وەر بگـرن و داواو پێداویسـتییە تایبەتییـەکانی نزیکەی (٤ (ملیۆن دانیشتوانی هەرێمی ناوبراو زۆر بە هەند وەربگرن و دابینی بکەن.

لەبەر ئەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نێـو نەتـەوەیی نـاتوانێ بەغـدا مـل کـەچ بکـات ، بـۆ جێبـەجێ کردنی بەرنامەی ناوبراو و وای لێ بکـات کـە پێداویسـتییەکانی گـەلی عـیراق لـە خـۆراك و دەرمـان و کاڵای هەمەجۆر بە شێوەیەکی یەکسان و تەواو بگەیەنێتە سوودمەندەکانی بەرنامەکە،کەوا لـە ژێـر دەستیدان،جا لەبەر ئەوە،ئەو نـاتوانێ(مەبەسـتمان حکومـەتی عیراقـە)،هـیچ چاکسـازییەکی بـاش وەدی بهێنێ بۆ جێ بەجێ کردنی بەرنامەکە لە کوردستاندا.

بۆ وێنە، کرێ و مووچەی کاربەدەست و فەرمانبەر و مووچەخۆرانی ڕێکخراوە نێـو نەتـەوەیی بـدات بە پێی ئەو ڕاژەیە کە لە بڕیاری بەرنامەی ناوبراودا دەستنیشـان کـراوە، هـەروەها ئـەو پرۆگرامـە پێویستە پاداشت و یارمەتییەك و هاندانێکی سەردەمانە دابین بکات بۆ مامۆستایانی قوتابخانـەکان ، کارمەنـدانی تەندروسـتی و هـەروەها کارمەنـدانی کارگوزارییـە گشـتییە شارسـتانییەکان لـە ناوچەکەدا.

ڕیکخراوەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان پێویستە لە کوردستانی عیراقدا ئەو ئەرکانە جێ بەجێ بکەن، کە لە وڵاتانی تر ئەنجامیانداوە بۆ بووژاندنەوە . ئەوانە پێویستە پشتگیری گەشە سەندنی هـەموو کارگوزارییـە گشـتییەکان و دروسـتبوونەوەو چاکسـازییەکان بکـەن ، بـە هاوکـاری و پشـتیوانی و دەست لە ناو دەستی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

کـاتێ وڵاتـە یـەکگرتووەکان بـیر لـە چاکسـازی یاسـاو ڕێسـای سـزاکان دەکاتـەوە ، پێویسـتە تایبەتمەندی بارودۆخی هەرێمی کوردستانی عیراق پشت گوێ نەخات ، چونکە لەوانەیـە کوردەکـان

ڕۆژێ لە ڕۆژان هەودای بوارە دیموکراتییەکەیان پەرە پێ بدەن و هەموو ڕووبەری عیراق دابپۆشێت ، لەسایەی سێبەری یاساو ڕژێمی دیموکراسییە تازەکەیاندا.

لە کۆتاییدا دەڵێم :- هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانەی ، کە لە دە ساڵی ڕابوردوودا بە ئەنجام گەیشتوون ، هیچ مانایەك نابەخشن و بێ سوود دەبن، ئەگەر بێت و ناوچەی دژە فڕین نەپارێزرێ و بە بەردەوامی داکۆکی تەواوی لێ نەکرێ ، بە شێوەیەکی ئەوتۆ ، کە ماوەیەکی زۆر دوورو درێژە خەڵکی ئەو ناوچەیە خواستیارو چاوەڕوانی ئەو داوایە ئەکەن کە ناوچەی دژە فڕین زیاتر بایەخی پێ بدرێت و فراوانتر بکرێ و بە تەواوی بپارێزرێت.

لێکۆڵینەوەکەی بەڕێز خەسرەو پیربال :- تەنیا زانیاریی کاریگەرو بە سوود نین ، بەڵکو زانیارییەکانی، جگە لەوەش هاندەرێکی ڕێك و پێکن ، گیانی گەشبینی ئایندەو وزەو وریایی ئەورووژێنێ وەك هەموو لاوێکی کوردی ڕۆشنبیری پێگەیشتووی سەردەمی تازەی نەوەی کورد ، هەوڵی داوە دڵسۆزانە کارگوزاری کۆمەڵگاکەی بکات و بە شێوەیەکی سوودبەخش و زانستییانە. کورتەیەکی لێکۆڵینەوەی باری ئابووری کوردستانی عێراق ، بە ڕاستی پەنجەرەو دەروازەیەکی ڕووناك و پێویست لەسەر ناوچەیەکی زۆر تایبەت ئەکاتەوە، ئەو ناوچەیەی کە نەتەوەی کوردی تێدا ئەژی ، هەرچەندە لە هەموو لایەکەوە ماوەیەکی زۆر لەژێر چەپۆکی مەترسی و کوشتن و بڕین و پێکدادانەدا خۆیان ڕاگرتووە و داکۆکی لە مان و نەمانی خۆیان ئەکەن لە ناو جەرگەی ئەو خۆڵەمێشەدا و ئەو بارو دۆخە ناهەموارەدا وزەیەکی ڕۆشنی ئارەزووی فەرمانڕەواییەکی تەواو دروست و تێنویەکی دیموکراسی و ڕۆشنبیرییەکی سەردەم بەرز بۆوە ، نەك هەر بۆ کوردستانی عیراق ، بەڵکو شایانی ئەوە بێت ،کە لە هەموو عیراقدا پەیڕەو بکرێ.

پرۆفیسۆر : کارۆڵ ئۆڵێری

6ی نۆڤەمبەری ٢٠٠١ – زانکۆی ئەمریکی –واشنتۆن

ئەم پیتانەی خوارەوە ئاماژە بەمانای بەرامبەریان دەکەن-:

پ . د ک : پارتی دیموکراتی کوردستان

ح. هـ. ك : حكومەتی هەرێمی کوردستان

ئا. ت : ئاخاوتنی تێگەیشتن

ی. ن. ك : یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان

ئە. ئا : ئەنجومەنی ئاسایش

ن . ب . خ / ٩٨٦ : نەوت بەرامبەر خۆراك / ٩٨٦

ر. ن . ح : ڕێكخراوە نا حكوومەتییەكان

ر. ن : ڕێكخراوی نێو نەتەوەیی (نێو دەوڵەتی(

-

-

-

-

-

-

-

-

-

-

-

## 1.پێشەکی

ئەم لێکۆڵینەوە وا داڕێژراوە، کە وەك پەرتووکێك هێڵی دۆزینەوەی ڕێگای بازرگانی ئاسان بکات بۆ ئەو کەسانەی چاو ئەگێڕن بۆ دۆزینەوەی ناوچەی بازرگانی و بەرژەوەندییان لە بازرگانیکردن لەگەڵ کوردستاندا هەیە،بەتایبەتی وڵاتانی ئەوروپا ، کە زۆر لە بارەی کێشەی کوردستانەوە نازانن و شارەزانین، بە تایبەتی ئەو گۆڕانکارییانەی، کە لە دوای کۆتایی جەنگی کەنداو پاش ڕاپەرینی بەهاری ساڵی – ١٩٩١ لە ناوچەکەدا هاتنە کایەوە و جێگیر بوون .

دوای جەنگی ناوبراو لە سەرەوە، کوردەکان ئەزموونێکی دیموکراسییان لە باکووری عیراق حکوومەتێکیان دامەزراند بە ناوی حکومەتی هەرێمی کوردستان(ح .هـ.ك .(

لێکۆڵینەوەکە بە کورتە باسێکی کوردستان دەست پێ ئەکا، کە کوردستان یەك وڵاتی یەکگرتووە،یەك مێژووی ڕابوردووی هەیە لە بوارەکانی: ئایین ,زمان،پلە و ئاستی دارایی، منیش، بە تایبەتی لە بواری ئابووری و دارایی کوردستانی عێراق دەکۆڵمەوە .ئەم لێکۆڵینەوەیە باسی بواری بازرگانی و ڕێو و ڕەسمەکانی لە کوردستاندا ئەکات هەروەها بایەخی گومرك و ڕێڕەو و بنەماکانیشی. خەڵك پێویستە ئەوە بزانن، کە کاتێ هەڵس و کەوت و پەیوەندی لەگەڵ کوردا بە شێوەیەکی گشتی دەکەن،ئەو ڕێباز و ڕێنماییانە ،بایەخیان بۆ باشتر کردنی بەڕێوەچوونی کار و پەیوەندییەکان بە شێوەیەکی باشتر هەیە، ئەوەش جگە لە هەندێ ڕێباز و ڕێ و ڕەسمی جیا جیای تر، کە پەیوەندییان بە کار و باری بازرگانییەوە هەیە .

من باسی ئاستی باری ئابووری و دارایی کوردستانی عیراق ئەکەم لەم دە ساڵەی دواییدا، واتە( ١٩٩١– ٢٠٠١ ) هەروەها دام و دەزگای بەڕێوەبردنی کوردستان و ئەزموونەکەی لە ماوەی فیدرالیەتدا لە باکووری عێراق (کوردستانی عێراق)،باسی بڕیاری سزاکانی ٩٨٦ زۆر بە وردی، لەگەڵ وردەکاری تەواوی ئەو ڕێبازەی، کە بڕیاری(نەوت – بەرامبەر خۆراك)ی لەسەر بەڕێوە ئەچێ، کە لە کاتی ساڵی / ١٩٩٦ ،باسی گیروگرفت و ئاستەنگە گشتییەکان دەکەم، تا لە کۆتاییدا ئەگەمە ئەوەی باسی ئەوە بکەم، کە بۆچی بازاڕی کوردستانی عێراق بە ئاسانی نەکەوتۆتە بەر دەستی بازاڕەکانی ئەوروپا و، ئەو پێشنیارو سەرنج و ڕێنماییانە چین کە ئێمە پێشکەشیان بکەین بۆ چاککردنی ئەو بوارەو بەرەو پێش چوونی وڵاتێکی، وەك کوردستانی عێراق لە باروو دۆخی ئێستایدا؟ .

1-2 / مەبەست و ئامانجەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە .

ئەم لێکۆڵینەوە و تاو و توێیەم وا نووسیوە، کەوا زانیاریی پێویست لە بارەی ئەزموونی دیموکراسی کوردستانی عێراق پتر شی بکەمەوە و باری ئابووری کوردستان زیاتر بخەمە ڕوو،و بواری بەڕێوەبردنی حکومەتی هەرێمی کوردستانیش ڕوون بکەمەوە. جگە لەوەش حەز ئەکەم کە کاراکردن و کارتێك کردنی بڕیاری / ٩٨٦ لەسەر کوردستانی عێراق شیبکەمەوە، هەروەها بایەخ و کارتێکردنی ئەو بڕیارە لەسەر گەلی کورد بە گشتی و لەسەر باری ئابووری بە تایبەتی، جگە لەوەش باسی کار و باری بازرگانی و پەیوەندی و ڕێنماییەکانیشی ئەکەم .

مەبەستی سەرەتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە ، کەوا چاو ببڕینە کار و کالآ گرنگەکان، باری ئابووری کوردستان و، ڕێبازێکی زۆر تازە بۆ بەڕێوەبردنی ئیشوکارەکانی دەوڵەتی مۆدێرن لە کوردستانی عێراق،دامەزرێنین .

لەوەش زیاتر پێمان لەسەر باسی کێشەکان و ئەگەرەکانی داگرتووە ,کەوا بەندن بە هەناردن و هێنان لە هەرێمەکەدا، هەروەها باسی ئەو هۆیانە بکەین کەوا بۆچی ناتوانین بازرگانی و پەیوەندییەکانمان گەشە پێ بدەین لەگەڵ وڵاتانی دەوروپشت وجیهان ، بەتایبەتی ئەوروپا و ڕۆژئاوا .

1-3 / سنووری لێکۆڵینەوەکە .

ئەم لێکۆڵینەوەم وا دارشتووە، کە باسی بیرۆکەو بیر و بۆچوونەکان بکەم،بۆ کۆمپانیاو سەرمایەدار و ئەو لایەنانەی ئارەزووی بازرگانییان هەیە لەگەڵ کوردستاندا،کە مەبەستم، تەنیا حکومەتی کوردستانی عێراقە (تەماشای نەخشەی کوردستانی عێراق ژمارە (١) بکە (

لەم لێکۆلینەوەیەدا من تەنیا باسی بارو دۆخی بازرگانی و ڕێو ڕەسم و بنەما و چالاکییەکانی هەرێمەکەم کردووە،هەروەها باسی پڕۆژە بازرگانییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێڕاقیشم کردووە، کە لە دوای شەڕی کەنداو و سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١/ وە دامەزرا .

1-4 / ڕۆژانەی بە بەرنامە کردن

ئەم بەشە تەوەرییەی لێکۆڵینەوەکەم لە بەشی سەرەوەی لێکۆڵینەوەکەمدا باسکردوە .

زۆربەی هەرە گرنگی زانیاریی جیا جیاو، بناغەی سەرەکی ئەزموون و تاقیگەری و نووسینی ڕۆژنامەکان، هەروەها زانیاری زمانە جیاجیاکانی جیهانی وەکو :ئینگلیزی، فەرەنسی و عەرەبی و سەرچاوەکانی کوردستانی عێراقی .

جگە لە وانەی سەرەوە، ئێستا چەندەها لاپەرەی ئینتەرنێتی کوردی لەگەڵ چەندەها لاپەڕەی ئینتەرنێت بە هەمووئەو زمانانەی کە بایەخ بە کار و کێشەی کورد دەدەن، لە بەڵگەنامەکانی کورد ئەکۆڵنەوە کردوویانە بەسەرچاوەی زانیارییەکی باشی جیهانی، لە بوارەکانی کێشەی کورد وەك کێشەیەکی جیهانی و، هەروەها لە بوارە بازرگانی و ئابووریو ڕێو و ڕەسمەکانی و داب و نەریت، لێرەدا بەشێکی کەمی شێوەی زانیاری وکەلتووری و هەندێ لە تاقیکردنەوە و ئەزموونی تایبەتی کەسایەتی ئەخەمەروو.

خۆشم هەندێ زانیاری بنەڕەتیم لەسەر ئەو ئەزموونە هەڵبەستووە ,جا چ لە بارەی هەندێ زانیاری، یا باری بازرگانیو هەندێ بابەتی تر.

1-5 / کلیلی بیرۆکەی لێکۆڵینەوەکە

چوار کلیلی سەرەکی هەن بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە -:

١. بڕیاری سزا نێو دەوڵەتی /٩٨٦ ، ٢- بڕیاری (نەوت – بەرامبەر خۆراك (،-3 ڕێو ڕەسمی بازرگانیی حکومەتی هەرێمی کوردستان ٤- بار و دۆخی ئابووری و دارایی کوردستان .

ئەو کەسانەی، کە ئەیانەوێ زۆر تر بزانن و زیاتر لە بارەی هۆکار و هاوکارە بازرگانییەکانی کوردستانی عێراق بزانن ، زۆر سوودو کەڵك لەم لێکۆڵینەوەیە وەر ئەگرن .

1-6 / پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە بەشێکیدا ، پێشەکییەکی پوختەی لە بارەی پێکهاتەی باری ئابووری کوردستانی عێراق خستۆتە بەردەست و من لەو بەشەدا ئەو هۆیانە شی دەکەمەوە و ڕوونییان

ئەکەمەوە، کە بۆچی ئەم بابەتەم هەڵبژارد و بۆچی ئەم چەشنە ڕێگەیەم بۆ لێکۆڵینەوەکەم هەڵبژاردووە .

دووەم بەشی لێکۆڵینەوەکەم بریتییە: لە باسی پێشکەش کردنی سەرەتای بناغەو ڕەگەزی کوردوکوردستان و سنووری وڵاتەکەیانو، باسی سیستەمی ڕۆشنبیریی زانکۆکان، لەوەش زیاتر باسی زمانی کوردی و ئایینی کوردو ئایینەکانی تری وڵاتەکە .

بەشی سێیەم لە لێکۆڵینەوەکەمدا، پێشەکییەکی باری ئابووری کوردستانی عێراق ، هەروەها چەشنەها ئاسۆی کوردستانی عێراق پێشکەش ئەکەم و لە بارەی (ح. هـ. ك) و ئەرکەکانی سەر شانی باسی بایەخی نەوت لە بواری داهاتی نەتەوەیی ، ئەخەمە بەر دەست، پتر لەوەش بواری چالاکییە بازرگانییەکانی ، ئەخەمە ڕوو و باسی بایەخی بڕیاری٩٨٦ی ئەنجومەنی ئاسایش (نەوت – بەرامبەر خۆراك)دەکەم، هەروەها کاریگەرییەکانی لەسەر گەلی کوردو،ئەم باسە قووڵ ئەکەمەوە و وردە واتاکانی ئەخەمە ڕوو و ئاشکرایان ئەکەم،کە چۆن کار دەکەنە سەر کار و چالاکییەکانی گەلی کورد، ئەوەش پیشان ئەدەم کە چۆن حکومەتی کوردستان، داهاتی، پارەو پوولەکانی بڕیارەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ دروست کردنەوەی وڵاتەکەی و گەشە پێدانی ناوچەکە بەکار ئەهێنێ ، بە هاریکاری و هەماهەنگی ئاژانس و ڕێکخراوە جۆراو جۆرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوەکانی حکومەتی و ناحکومەتییە بیانییەکان، ئەنجامی دەدەن.

من زیاتر هەوڵ دەدەم بە درێژی باسی چالاکییە بازرگانییەکان لەهەرێمەکەدا بکەم و وردی بکەمەوەو باسی هەناردن و هێنان و چالاکییەکانیان و کێشەی گواستنەوە و هاتووچۆ ، بەتایبەتی ئەوانەی بە کاروباری هاتووچۆ و پەیوەندیەکانی دەرەوە وە بەستراون بە ڕێگا و بان، ئەو بازاڕە بەرفراوانەی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا واڵا کراوەتەوە.

کۆتایی بەشەکە باسی هەندێ ئاستەنگ و گیروگرفت و کێشەی وڵاتەکە ئەکەم و هەندێ پێشنیار و ڕێنمایی و پرۆژەو ڕێگای ئاسان بوون و ئاسانکاری پێشکەش ئەکەم، بە هیوای سوود لێ وەرگرتنیان، بە پێی توانا لە بواری گونجاو و شیاوی ئەو بابەتانەدا .

لە چوارەم بەشی لێکۆڵینەوەکەمدا،باسی بازرگانیی کوردستانی عێراق و ڕێو ڕەسم و ڕێنمایی و ئاسانکاریو گیروگرفتەکانی ئەکەم، بە شێوەیەکی گشتی وەك پێشەکییەکی ڕوون و ئاشکرا و

ڕاشکاوانە و دڵسۆزانە. بازرگانی و هۆکار و هاوکارییەکانی شی ئەکەمەوەو باسی کۆبوونەوەکانی بوارەکانی بازرگانی ئەکەم،ڕاستی و دروستی بە شێوەیەکی ئاسایی و سادەیی پێشکەش ئەکەم، گومرك، پەیوەندییە بازرگانی و ڕێ و ڕەسمەکانی،هەروەها تەکنەلۆژیای پەیوەندییەکانی دەرەوە و ناوەوە لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە کوردستانی عێراقدا.

لە کۆتایی ئەم بەشە ئاماژە بە هەندێ پێوەر و کێشانە ئەکەم و،هەندێ ڕێگای چارەسەری پێش ئەکەم، بۆ بەرەو پێشچوون و بەردەوام بوونی پڕۆژەکان و ئەو ئەرکانەی کە حکوومەتی هەرێم خستوونیەتە ئەستۆی خۆی‌و پێویستی سەر شانییەتی بەو پەڕی چالاکی و دڵسۆزانە بە ئەنجامیان بگەیەنێ.

لە هاوپێچی لێکۆڵینەوەکەمدا گەلێ نەخشە و، ئامارو ,بەڵگەنامەی تر و خشتەیەکی زانیاریم پێشکەش کردووە هیوادارم سوودبەخش بن.

## بەشی دووەم:

### کوردستان و نەتەوەی کورد (سەرەتا و بناغەی ڕەسەنی کورد(

### 2-1-ڕەسەنی کورد

سەرەتایی کورد ئەگەڕێتەوە بۆ هۆزەکانی هیندو ئەوروپییەکان کەوا لەوێوە کۆچیان کردووە بۆ کوردستان و لەوێ ، بەهەموو شێوەکانی ئەوسەردەمەی ژیان تێکەڵاوی دانیشتوانی ناوچەکە بوون. هەر لە کوردستانی ئێستا بوونەتە هاونیشتمانی ئەو وڵاتە، و ولاتەکە بەپانتایی سەرانسەری خۆی بە ناوی ئەوانەوە ناو نراوە( کوردستان – ولاتی کوردان) بەپێی قۆناغەکانی گەشەسەندن و پێشکەوتنی کورد، بەڵام تائێستا سەرەتایەکی ڕوون دەست نیشان نەکراوە لەبارەی مێژووی کوردو کوردستان هەرچەندە هەموو مێژوونووسەکان بەتەواوی لەوە دڵنیان کە کورد لە کوردستاندا هەزاران ساڵ لەمەوبەر لەو ناوچەیە بە تەواوی و بە بەردەوامی ژیاون , هەروەها لەو ماوە درێژەدا، زۆر لە گەلانی تر بە شێوەی بەربلاو و پچڕ پچڕ لەگەڵ نەتەوەی کورددا تێکەڵاو بوون،یا لە چوارچێوەی ئەم نەتەوەی کوردی خۆگرە تواونەتەوە، یاخود هەندێ کەمایەتی تر تا ئێستاش ماون و شان بەشانییەکتر، وەك برا بە خۆشی ژیانیان بەسەر بردووە .

کوردەکان بەهەزارن ساڵ لەمەوبەر لەسەر زەویی باوك و باپیرانی خۆیان ژیاون،کە ئێستا پێی ئەڵێن (کوردستان ) ، هەموو میللەتان ئەوەش ئەزانن و کەس نیە ئەوە ڕەت بکاتەوە، یا بتوانێ خۆی لێ بدزێتەوە چ لەسەر بواری کەسایەتی ,یا لەسەر بواری کۆمەڵ و ڕێکخراو،یا دەوڵەتییەوە،تەنیا چەندرژێمێکی فاشی و هەڵەشەو کەللە ڕەق نەبن،کە ئەوانیش داگیرکەرەکانی پارچەکانی کوردستانن، کە بەردەوام بە هەوڵ و کۆششی دوژمنایەتی کورد و تواندنەوە و کوشتن و دەربەدەرکردنی بە هەموو چەکێکی کۆ کوژی تازە و کۆن و بۆ هەموو هاوپەیمانییەك لەپێشبڕکێدان بۆ چەکداری وڕامیاری لە ناوبردنی کورد و بەردەوامیی دەسەڵاتیان و داگیرکردنی کوردستان هەتا سەر، بێگێروگرفت، ئەوانەش باش ئەزانن ڕەوڕەوەی مێژوو، بەرەو پێش ئەچێت و بیانەوێ و نەیانەوێ،هەر ڕاستی سەر دەکەوێت و خۆی دەسەپێنێت.

ڕەگەز و ڕەسەنی کورد ئەگەڕێتەوە بۆ میدییەکان و ئیمپڕاتۆریەتی مید،ئەو هۆزەی، کەلە /٢٠٠٠ ساڵ پێش مەسیح، لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بەرەو ئێران هاتوون و لە کوردستان ژیانیان بەسەر

بردووە.میدییەکان توانییان ئیمپراتۆریەتێکی گەورە دابمەزرێنن و ئەزموونێکی دیموکراتی بەر فراوان دابهێنن لەو قۆناغە مێژووییە دواکەوتووەی مرۆڤایەتیدا، ئەو دیموکراسییەی میدییەکان دایان هێنا لەسەر بناغە و بنەمایەکی هەرە ئازاد و سەربەست و خۆ هەڵبژاردنی بە خۆوە گرتبوو لەسەرتاسەری دنیاشدا بڵاوبۆوە بۆ ئاشووری و سۆمەری و بابلیو چەندەها گەلانی دەور و پشت سوودیان لێ وەرگرتووە . هەروەك مێژوونووسانی ئەغریقی و جوولەکەکان و چەندەهای تر باسیان کردووە، لەوانەش باشتر سەرەنجێکی پەرتووکەکەی (دیموکراسیەت لە میدییەکانەوە بۆ واشنتن)، کە لە لایەن دوو پرۆفیسۆری ئەمریکایی( ) کە هەردووکیان مامۆستای زانکۆی ( ) ئەمریکین لە واشنتن،هەردووکیان بە ئاشکرا ئەو ڕاستییانەی پەیوەندییان بەو مێژووەوە هەیەڕوونیان کردۆتەوە، بۆ ئەوەش، پەنایان بردۆتە بەر چەندەها پاشماوەی مێژوویی ئەو کاتە و سەرچاوە گرنگە کۆنەکانی مێژووی چەندەها گەلانی جۆراو جۆر ،بۆ گەیشتن بەڕاستیی لە پێناوی ڕاستیدا.

لەو پەرتووکەدا مێژووی کوردو چۆنیەتیی سەلماندنی، کە میدییەکان باو و باپیری کوردەکانی ئیمرۆن و چۆن دیموکراسییان دامەزراندووە؟ چۆن ڕەگ و بنەماو ڕێنماییەکانی بڵاوبوونەتەوە تا گەیشتۆتە ئەمەریکا ، ئەم دیموکراسی و شارستانییەتەی ئەمەریکا لەسەر بنەماکانی دامەزراوە، ئەوەش پێویستە بڵێین ناوی پەرتووکەکە.(.(Democray From Meeds to Washinton

ئەو میدییانە لە ساڵی ٦١٢ پ.ز ئیمپراتۆرییەتێکی دیموکراسی تازە بابەتیان لەو قۆناغەی مێژوودا دامەزراندووەو بەبەردەوامی لە فراوان بوون دا بووە ,تا ئەوکاتەی لە ساڵی(٥٥٠) پ.ز پێش کەوتووە.

هەروەها پەرتووکی (د. مەکدۆنالد / ١٩٩٢ – لاپەڕە – ٨٥)دا ,ئەڵێ:– کە ئەم نەتەوەی کوردە ناوەکەی وەك لە پێشەوە باسمان کرد وەك هەموو گەلانی سەر زەوی کۆن و ڕەسەن چەند گۆڕانکارییەکی بەسەردا هاتووە،لە چەند قۆناغێکی مێژوویی لە مەوبەر ناوی (کارداکا) بووە و بووەتە (کوڕێك)، یا) گورتی)،سۆمەریەکانیش ئاماژەیان بەو گۆڕانکارییانەکردووە، لە ساڵانی (٢٠٠٠)پ.ز هەروەها مێژوونووسە ئاشوورییەکانیش ئاماژەیان بەو زانیارییە گرنگە کردووە، لە پەرتووکی مێژوویی خۆیان لە سەدەی یانزەهەمی پ.ز.(پەرتووکی یاسن، کە لەساڵی ١٩٨٥ دەرچووە لاپەڕەی ٣٥. (

لەو لێکۆڵینەوەی سەرەوەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە کوردەکان لە کۆمەڵێ تیرەو هۆزی زۆر کۆنن، کە لە گەلە قۆقازییەکانی ناوچەی سەرووی ئەو ناوچەوە هاتوون و لە سنووری ئەو ناوچە شاخاوییانەی کە لەسەر ڕۆخاوەکانی دەریای قەزوینەوە هاتوون لە قۆناغی مێژووی (کارلیك)ەوە دەست پێ ئەکات .

ناوەندی سنووری ئەم وڵاتە لەسەر هەردوو بەشی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس لەنگەر ئەگرێ و بۆ بەشی خوارو و ڕۆژئاوای زنجیرە چیاکانی ئەنادۆڵ لە کوردستانی تورکیا درێژ ئەبێتەوەوئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات تا ئەگاتە سنووری زنجیرە چیاکانی عیراق و سووریای ئێستا ئەبڕێ .

## / 2-2سنووری جوگرافیای کوردستان (وڵاتی کوردان (

کوردستان وڵاتی کوردانەو وڵاتێکی زۆر جوانە و ئەکەوێتە بەشێکی ستراتیجی زۆر گرنگی جیهانەوە، پانتاییەکی زۆر بەرفراوان و بەربڵاوی هەیە کە بەرامبەری هێڵی پانی (٣٦,٥٠) و (٤٩) هەروەها لە نێوان هێڵی درێژی5 – 30,5) ر٤٠) هەر لە کێشوەری ئاسیاوە کەوا پانتایی سنوورێکی بەرفراوان ئەگرێتە خۆی کە نزیکەی (٥٠٠,٠٠٠) کم$^2$,ئەوەش یەکسانە بە ڕووبەری وڵاتی ئیسپانیا (بنۆڕە نەخشەی ژمارە/٢ (

ڕووبەری وڵاتی کوردستان دابەش ئەبێت بەسەر چوار وڵاتی داگیرکەری کوردستان، بەم شێوەی خوارەوە :

خشتەی ژمارە –١ ڕووبەری پارچەکانی کوردستان:

| ڕێژەی ٪ ڕووبەری کوردستان لە هەریەکێ لەو وڵاتانەی کە داگیریان کردووە | ڕووبەر ی گشتی یەك پارچەی کوردستان بەرامبەر ڕووبەری گشتیی کوردستانی مەزن بە ڕێژەی لە% | ڕووبەری گشتی هەموو وڵاتەکە بە $Km^2$ | جوگرافیایی ناوچەکە |
|---|---|---|---|
| 26.9% | 24% | 210.000 کم$^2$ | کوردستانی باکور )کوردستانی تورکیا( |
| 11.83% | 39% | 195.000 کم$^2$ | کوردستانی ڕۆژهەڵات )کوردستانی ئیران( |

| کوردستانی باشوور<br>)کوردستانی عێراق ( | 83.000 | 16% | 18.86% |
|---|---|---|---|
| کوردستانی ڕۆژئاوا<br>(کوردستانی سوریا( | 15.000 | 3% | 18.10% |
| کوردستانی مەزن | 53.000 | 100% | |

سەرچاوەی 1998 / GBSR) لاپەڕەکانی ٣٣، ٣٥

خشتەی ژمارە (١) ڕووبەری هەر پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستان پیشان ئەدا،هەروەها ڕێژەی ڕووبەرەکەی بەرامبەر ڕووبەری گشتی ئەو وڵاتەی داگیری کردووە، لەگەڵ ڕووبەری گشتی هەرچوار پارچەکەی کوردستان کە ناسراوە بە (کوردستانی مەزن، یا کوردستانی گەورە) ئەوەش ئاشکرایە، لەکاتی خۆیدا کوردستانی گەورە پارچە پارچەکراوەو، بە خەلاّت دراوە بەو وڵاتانەی دراوسێ ،بۆ پاراستنی مافی بەریتانیا ,کە زلهێزی گەورە و بالاّ دەستی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بوو.

لە ڕوانگەی جوگرافیاوە، کوردستان لە نێوان سنووری (٣) سێ ئیمپراتۆرییەتی کۆن بووە، ئەوانیش ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی و ئیمپراتۆرییەتی فارس و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بووە، و هەروەها. داگیرکەرانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست، کە دەوڵەتانی بەریتانیاو فەرەنسا لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە جەنگی جیهانی یەکەمدا توانییان سوریا و عیراق لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بستێننەوە و ڕزگاریان بکەن ,بەڵام کوردستانی گەورە دابەشکرا بە (٥) بەشەوە (بنۆڕە نەخشەی ژمارە/٢ .B ) (یاسین/ ١٩٩٥ لاپەڕە/ ٤٢ (

کوردستانی عیراق لە چوار پارێزگا پێکهاتوە: (هەولێر، دهۆك ,سولەیمانی و کەرکوك) هەروەها بەشێك لە پارێزگاکانی دیالە و سەلاحەدین ( ناوی ئیستای کراوە بە تکریت)و پارێزگای کوت.

ڕووبەری گشتی نزیکەی (٨٣,٠٠٠کم (²کە نزیکەی (١٦ (%عیراقەو بە قەدەر ڕووبەری نەمسایە، هەروەها لە ڕووبەری (٢٤ دەوڵەتی ئەورووپی لە نێوان ٢٦ دەوڵەتی یەکێتی ئەوروپا) گەورەترەو هەشت ئەوەندەی ڕووبەری لوبنانە ,سیانزە ئەوەندەی ڕووبەری فەلەستینە . بنۆڕە لاپەرە / ١١٢ کتێبی چالیانساڵی .1978 /

## / 2-3جوگرافیای – ڕامیاری

هەر لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، کوردستانی گەورە بەسەر (٥ (دەوڵەتی خاوەن دەسەلات لە ناوچەی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست و دەرەوەیدا دابەشکرا ,ئەوانە بە پێی گەورەیی ڕووبەری کوردستان، کە پێی خەلاتکران ، عیراق ١٨٪ ، سوریا , 6% هەروەها یەکیەتی سوڤیەتی کۆن (٢٪) بەپێی زانیاری سەرچاوەی .B )یاسین لاپەڕە ٣٣ ساڵی ١٩٩٩.(

کوردی ئێران لە ژێر دەستی ڕژێمی ئێرانی و دەسەڵات و یاساکانی دابوون بە تەواوی هەرلە ساڵی ١٥١٤ (جەنگی چالدیران). هەر سێ پارچەی تری لە ژێر دەستی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دابوون

هەرلە بەرواری ناوبراوەوە تاکو ئەو ئیمپراتۆرییەتە ڕووخا لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا. کوردەکان تاکە نەتەوە بوون کە کۆمەڵێکی زۆر گەورە بوون لە جیهانی سێیەمدا کە هیچ نوێنەرێکیان لە کۆمەلەی گەلانی یەکگرتوو (عصبە الامم)دا نەبوو هەرچەندە جوگرافیای ڕامیاری کە بەسێ پەیمانی دەوڵەتی گەورە گەمارۆ درابوو، ئەوانیش عیراق و سوریا لە جیهانی عەرەبی ,ناتۆ لە تورکیاوە و لە خوارووی ئاسیاش ناوەندی ئاسیا کە ئەکاتە ئێران و تورکستان ,هەروەها تا ئێستاش یەکیەتیی سۆڤیەتی کۆن ولأتەکانی قۆقاس، ئەرمێنیای ئێستا و ئازر بایجان و جۆرجیا. لە ڕاستیدا کوردەکان تاکو سەردەمی شەڕی ساردی نێوان دووجەمسەری ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلأت خۆیان و ولأتەکەیان هەموو کاتێ وەك سنووری مەیدانی ململانێ و هەڕەشە و تۆقاندن لە لایەن ئەڵمانەکان و هەردوو پەیمانی ناتۆ و وارشۆوە بەکارهێندراون.

## 4-2 / دانیشتوانی کوردستان

ژمارەی گشتیی دانیشتوانی ناو کوردستانی عێراقی ئێستا، کە لە ژێر دەسەلأتی حکومەتیهەرێمی کوردستانە نزیکەی (٣,٥) سێ ملیۆن و نیوە، هێشتا کە کوردستان بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی سێیەم دەوڵەتە لە نێوان ژمارەی (١٩٣ (دەوڵەتی خاوەن نوێنەر لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا لەسەر گۆی زەوی .

### دانیشتوانی کوردستانی عێراق :

خشتەی ژمارە/٢ دانیشتوانی کوردستان

| ناوچەی جوغرافی | ژمارەی دانیشتوانی لە ساڵی ١٩٩١/ بە ملیۆن | ڕێژەی لە سەدی بەرامبەر ژمارەی دانیشتوانی گشتیی کورد | ڕێژەی سەدی دانیشتوانی لە بەراوردکردنیدا بەرامبەر دانیشتوانی ئەو ولأتەی داگیری کردوون |
|---|---|---|---|
| کوردستانی باکوور تورکیا | 13.15 | 44.32% | 24% |
| کوردستانی ڕۆژهەلأت/ ئێران | 9.26 | 31.21% | 18.97% |
| کوردستانی باشوور/ عێراق | 4.76 | 4.18% | 28% |

| کوردستانی ڕۆژئاوا/ سوریا | 1.24 | 4.18% | 11% |
|---|---|---|---|
| کوردستانی ئەرمینیا, ئازر بێجان – جۆرجیا | 0.301 | 1.01% | 11.% |
| ئازر بێجان ئەنەتولیا | 0.385 | 1.30% | %7ر |
| کوردستانی ناوچەکانی تری | 0.500 | 1.69% | 1.03 |
| کوردستانی لبنان | 0.075 | 0.25% | 2.59% |
| کۆی دانیشتوانی کورد | 0.29.67 | 100% | |

کۆی دانیشتوانی هەر پارچەیە لە پارچەکانی کوردستان هەروەها ڕێژەی لەسەدای بە بەراوردی لەگەڵ کوردستانی مەزن و دانیشتوانی ئەو وڵاتەی بە زۆر پێیەوە بەستراوە.

زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان باسی ژمارەی دانیشتوانی کوردستانیان کردووە، بەلآم هەریەکەی ژمارەیەکی جیاوازی داوە، بۆ ئەوەش ئامـاژە بـە سەرچـاوەی): میهر داد – ئـازادی )،کـە مێژوو نووسێکی کوردە،بە پێی هەڵسەنگاندن و مەزەندەی ئەو ، کۆی دانیشتوانی پارچەکانی کوردستان، بە پێی ئەم نەخشەیەی خوارەوەن -:

خشتەی ژمارە/٣

| ڕێژەی لە سەدای کورد | کۆی دانیشتوانی کورد | کۆی دانیشتوانی وڵات بە گشتی | وڵات |
|---|---|---|---|
| 28.8% | 19.000.000 | 65.900.000 | تورکیا |
| 11.3% | 8.400.000 | 73.900.000 | ئێران |
| 24.8% | 5.600.000 | 22.600.000 | عیراق |

| سوریا | 17.200.000 | 1.600.000 | 9.3% |
|---|---|---|---|
| پارچە بەربلاوەكان | 500.000/00 | 500.000 | |
| كۆی گشتی | 181,000 | 35.100.000 | |

سەرچاوەی میهرداد ئازادی /٢٠٠٠ ناونیشانی:

http//www. kurdish.com/Kurdistan / People demography. htm)

هەروەها ئەبێ ئەوەش بە هەند هەلگرین، كەوا ژمارەیەكی زۆری كورد بە پەرتوبلاوی لە زۆر ولاتانی تری گۆی زەوی ئەژین لە هەمووشیان زیاتر لوبنان و بەتایبەتی ولاتانی رۆژئاوا و ئەوروپا. ( جالیات – / ١٩٨٠ لاپەرە / ٤٤ (

دانیشتوانی كوردستانی عیراق ئێستاكە نزیكەی (٦,٠٠٠) ملیۆنە ,رێژەی (١٦٪) دانیشتوانی كوردن لە جیهاندا، هەروەها ٢٨٪ ی دانیشتوانیعیراقن، ئەوەش لەبیر نەكەین كەوا زۆر كەمایەتیی تر لە گەڵیاندا ئەژین لە كوردستانی عیراقدا وەكو :توركمان و ئاشووری و كلدانی و عارەب بە پێی سەرچاوەی: ﴿لاوكراوەی مەكتەبی ناوەندی دیراسات ی پارتی دیموكراتی كوردستان، ژمارە ٣٣ ) (GNRBژمارە ٣٣ لاپەرە / ٣٦ ساڵی ١٩٩٩ (

## 2-5-ئایینی كورد

كوردەكانی سوریا و لوبنان درووزەكان و عەلەویی و ئیسماعیلییەكان ,هەروەها كەمایەتییە مەسیحییەكان بە پێی مەزهەبە جیاجیاكانیان، زۆربەیان سەر بە كەنیسەی ئارسودۆكسین و خۆیان بە جیاواز ئەزانن .لەسەر بنەماو پرەنسیپی ئایینی كوردەكان، لەو كاتەوە كە عەرەب كوردستانی داگیر كردووە، لە سەدەكانی ١٧حەفدەم) ماكدۆناڵد/ پەرتووكی ساڵی ١٩٩٢– لاپەرە –١٣) ئایینی ئیسلامی پێرەو كردووە , زۆری زۆربەی كوردەكان موسوڵمانن و زۆربەی زۆریشیان سونین (د قاسملو– ١٩٦٥– لاپەرە .(24–

کوردەکان ئایینی ئیسلامیان لە نێوان سەدەی (١٧–١٩) وەرگرتووە ,بەڵام لەوە پێش زەردەشتی بوونە، ئەوان بەو پێیە ئاگریان پەسند کردووە، وەك هێمایەکی پاکی و بێ گەرد،هەروەها لە کوردستاندا ژمارەیەك جوولەکە وەك پەناهندە لە کوردستاندا ژیاون، هەر لە کاتی ئیمپراتۆریەتی ئاشووریەکان ئەو برا جوولەکانە بە پێی تەوراتی پیرۆز، کە ئەڵێ دەسەڵاتدارانی جوولەکەی ئەو دەمە توانییان ڕەزامەندی سەرکردە کوردەکان وەربگرن و ژیانی پڕ ئاشتی و خۆشی بۆ جولەکەکان دابین بکەن، هەتا بەشێوەیەکی تەواو توانیان لە ناوەندی کوردستاندا بلاوببنەوە و جێگیر بن و ئایینی خۆیانی تێدابلاوبکەنەوە بێ هیچ ئاستەنگێك لە لایەن کوردەکانەوە .
سەرچاوەی (میهرداد ئازادی لاپەڕە / ١٠٠ ساڵی ٢٠٠٠ (

لە ڕوانگەی ڕۆشنبیرییەوە، ئایینی ئیسلام هەموو دەم هۆکارێکی پاڵپێوەنەرنە بووە بۆ گەشەسەندنی گیانی نەتەوایەتیی کوردایەتی، بەڵکە ئاستەنگ و بە هەرڵستکاریش بووە بە زۆری، هەروەها بۆ گەشەسەندنی پێناسەی نەتەوەی کورد، چونکە ئاینی ئیسلام هەتا ئێستاش هەر هەوڵ و کۆششی لە پێناو ئەوەدایە، کە هەموو نەتەوەکان لە ژێر ئالأی ئیسلام ڕێکبخاو، پێناسەی نەتەوەیی کپ بکاتەوە، هەر چەندە نەیتوانیوە بەرامبەر تورك و فارس و عەرەبەکان و نەتەوەکانی تری جیهان ئەوە بکات، چونکە بەردەوام ئەوانە، حکومەتێکی سەربەخۆ و، ولأتێکی سنووردار یان هەبووە ونەیانهێشتووە بە هیچ هۆکار و هامرازێك ئاینی ئیسلام، یا هەر شتێکی تر هێزی نەتەوایەتییان لێ بسێنێت و بێ دەوڵەتیان بکات، تەنیا بۆ کورد نەبێت،هەروەکو ئەشبینین چونکە دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عیراق و سوریا، ئیسلام ئایینی ڕەسیمی دەوڵەتە(الاسلام هو الدین الرسمی للحکومە) حکوومەتەکانیان ئیسلامە، بەڵام ڕێگایان نەداوە بە کورد، کە باسی پێناسەی نەتەوایەتیی خۆی بکات، بەڵکە ئەو داگیرکەرانە بە درێژایی فەرمانڕەوایی خۆیان هەوڵیان داوە، کە بە دوو جەمسەر بیتوێننەوە، لە لایەکەوە بە جەمسەری ئیسلامی نزیکی بکەنەوە لە نەتەوەیی خۆیان و لە لایەکی دیکەشەوە،لەقاڵبی نەتەوایەتیی خۆیان( تورك و فارس و عەرەبدا) بیتوێننەوە , ئەوەش بە ڕاستی ڕێڕەوی هەموو داگیرکەران بووە لە هەموو سەردەمێکدا، بەرامبەر بەنەتەوەی کورد .

<u>2-6-ڕۆشنبیری و سیستەمی پەروەردە:</u>

سیستەمی پەروەردەی کوردستان لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بە پێی بار و دۆخی ڕامیاری وڵاتەکە لە نێوان دەسەڵاتەکانی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانی عیراق و لیژنەی باڵای فێرکردن ئاراستە ئەکرێ. وەزارەتی پەروەردە بڕیاری تایبەتیی گشتیی هەموو قۆناغەکانی قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی و خوارووی ئاستی زانکۆکان دەر ئەکا و بە ئەنجام ئەگەیەنێ، بەڵام لیژنەی باڵای فێرکردن لە کوردستانی عیراقدا بەرپرسایەتی فێرکردنی سەرتاپای زانکۆکان و پەیمانگاکانی کوردستان ئەبات بەڕێوە و جێ بەجێیان ئەکات.

دابین کردنی هەموو خەرجیی وەزارەتی پەروەردە و لیژنەی فێرکردنی باڵا بە هەموو مووچەی مامۆستاو بەڕێوەبەر و کرێکاران لە هەموو پلەو پایەکاندا لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بەبەردەوامی دابین ئەکرێ .

قۆناغەکانی خوێندن لە کوردستاندا بریتین لە:- ماوەی دوو ساڵ پێش چوونە قوتابخانەی سەرەتایی کە پێی ئەڵێن قۆناغی باخچەی ساوایان لەوەش بەدووا (٦) شەش ساڵ قوتابخانەی سەرەتایی دەست پێ ئەکا بۆ منداڵی (٦ - ١٢ ) ساڵ , کە ئەو قوتابخانەیە بەزۆر پێ خوێندنە، واتە قوتابییان لەو تەمەنەدا ناچار ئەکرێن کە بخوێنن تا قۆناغی سەرەتایی ئەبڕن .(٦)ساڵ قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندییە کە ئەو قۆناغە بە پێی ئارەزووی قوتابی خۆیەتی و بە زۆرینە و ناچاری تێدانییە ، قۆناغی دوایی ، کە قۆناغی پەیمانگاو زانکۆکانە پاش قۆناغی دواناوەندی لە نێوان ( ٢ - ٦ ) ساڵە ، جگە لە قوتابخانەکانی دواناوەندیی زانیاری و وێژەیی، زۆر قوتابخانەی کارگوزاری و پیشەیی هەن ، وەکو :- بازرگانی - پیشەسازی - کشتوکاڵی .... هتد . کە خوێندن لەو قوتابخانانە ماوەکەی سێ ساڵە ، پاش. قۆناغی ناوەندی بەو قوتابخانەش ئەوترێ:- قوتابخانەی پیشەیی ، کە قوتابی تێیدا فێری پیشەیەکی تایبەتی ئەبێ و ئەبێتە کادری مام ناوەندی لە کۆمەڵگای شارستانیدا .

قۆناغی فێرکردنی باڵا کە ماوەکەی بریتییەلە (٢-٦)ساڵ بۆ قوتابییانی تەمەنی(٢٨-٢٣) ساڵە، بەڵام قۆناغەکەی تر کە هی قۆناغی پەیمانگاکان ماوەکەی بریتییە لە (٢)ساڵی تەواوی ڕۆژ ژمێرییە، کەوا بڕوانامەی دبلومیان (BA) پێ ئەبەخشرێ, هەروەها لە زانکۆکان بڕوانامەیBSC لە بوارەکانی زانست، پزیشکی، ئەندازیاری، ڕۆشنبیری، هونەری ...هتد پێ ئەدرێ لە هەر سێ زانکۆکانی سەلاحەدین، دهۆك و سلێمانی، هەروەها دبلۆمی تایبەتیش یا دبلۆمی باڵاش ئەبەخشن

به قوتابیانیان ،بڕوانامەی ماستەری (P.h.D.s )بڕوانامەی پرۆفیسیۆری ئەبەخشن لە بوارەکانی پزیشکی و ڕۆشنبیری و هونەر و پەروەردە و یاسا و بەشە مرۆڤایەتی و کۆمەلآیەتیەکان.. هتد. سەرچاوە (پەروەردە لە کوردستاندا.(

سەرچاوە http//www.Kdp-ankara.org.tr/ education:

خشتەی چوارەم

زانیاریی پەروەردەیی لە کوردستانی عیراقدا لە سالّی ١٩٩٨1999 –

| ژمارەی بەشەکان | ژمارەی کۆلێج و قوتابخانەکان | ژمارەی قوتابییان | ژمارەی فەرمانبەرانی فێرکردن | پەیمانگای پەروەردەیی |
|---|---|---|---|---|
| 44 | 12 | 7524 | 444 | زانکۆی سەلاحەدین |
| 18 | 7 | 3067 | 159 | زانکۆی سلێمانی |
| 16 | 7 | 1689 | 149 | زانکۆی دهۆك |
| | | | | پەیمانگای تەکنیکی |
| 9 | 1 | 1077 | 35 | پەیمانگای تەکنیکی/ هەولێر |
| 8 | 1 | 1628 | 23 | پەیمانگای تەکنیکی/سلێمانی |
| 5 | 1 | 845 | 56 | پەیمانگای تەکنیکی/ دهۆك |
| | | | | قوتابخانە دواناوەندییەکان |
| | 146 | 42612 | 2982 | هەولێر |
| | 182 | 52124 | 2492 | سلێمانی |

|  | 97 | 27004 | 1020 | دهۆك |
|---|---|---|---|---|

سەرچاوەی زانیارییەکانی سەرەوە http://members.aol. Com/ Krg site/ edueafion. ):شوێنی ئینتەرنێتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان. (

بەشێکێش لە داهاتی بڕیاری /٩٨٦ (نەوت بەرامبەر خۆراك) بۆ دابینکردنی خەرجیی سیستەمی فێرکردن خەرج ئەکرێ.لە ساڵی ١٩٩٧ تا ئێستا حکوومەتی هەرێمی کوردستان (١٦٠) قوتابخانەی دواناوەندیو(٨٥) قوتابخانەی سەرەتایی لە کوردستانی عێراقدا دروست کردووە، هەروەها قوتابیەکان هەموو پێداویستییەکی خوێندنیان بۆ دابین کراوە. لە بواری فێرکردن و خوێندنی بالاشدا، حکومەتی هەرێمی کوردستانی عیراق پلانێکی ئامادە کردووە بە (٢٥) ملیۆن دۆلاری ئەمریکی، جگە لەپێشەوەچوون و گەشەسەندن و گۆڕانکارییەکی زۆر لە هەرێمەکەدا لە ئارادایە .

سەرچاوە: حکومەتی هەرێمی کوردستان (چالاکییەکانیی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی/ ٢٠٠٠) لە بواری ئاوەدانکردنەوە و پەروەردە لاپەڕە. (57-59)

پرۆژەی رژێمی خوێندنی باڵا

بابەتی لێکۆڵینەوە و تاوتوێ و گفتوگۆی سەرەکیی کۆنفراسی ساڵی 2001 /کورد بۆ کۆنفراسی خوێندنی باڵا (٢١ – ٢٣) / ٤ / ٢٠٠١ لە هەولێر بەسترا, هاوبەشانی کۆنفراس لەهەر سێ پارێزگاکانی کوردستان بە ئامادە بوونی نوێنەری زۆربەی وڵاتە بیانییە پێشکەوتووەکان، پتر لە (٦٠٠) ڕاوێژکاری جۆرا و جۆری زانکۆکلن و چەندان هەوادارانی زانست و شارەزامەندانی ڕامیاری و زانستی هاوبەشییان تێداکرد .

سەرچاوە : ژمارە( ٥ی ئیمڕۆی کوردستان لاپەڕە /١ ساڵی /٢٠٠١) تکایە بنۆرە هاوپێچەکان (

مەبەستی کۆنفراسەکە ئەوە بوو، کە چاکسازیی تەواو لە ڕژێمی خوێندنی باڵا لە هەرێمەکەدا ئەنجام بدەن ،بە شێوەیەك کە بتوانێ بە فریای پێشکەوتن و گەشەسەندنی کۆمەڵگای کورد بگات

.

ماوەی ساڵی خوێندنی ئەکادیمی لە کوردستانی عیراق لە سەرەتایی مانگی (١٠) دەست پێ ئەکا تا کۆتایی مانگی (٦) ی هەموو ساڵێك.

## 2-7 زمانی کوردی

زمانی کوردی سەر بە زمانەکانی خێزانی هیند و ئەوروپییەکانە بەشێکیشە لە زمانی فارسی، دایەلێکتە سەرەکییەکانی زمانی کوردی دووانن کە زۆر ناودارن ئەوانیش:– دایەلێکتی سەروو (باکور) پێی ئەڵێن کرمانجی ، دایەلێکتی بەشی خوارووش (باشوور) هەیە پێی ئەڵێن:– سۆرانی .

جگە لەوانەش دیالێکتی بچووکتر هەن ،بە پێی هۆکارەکانی جوگرافیای کوردستان و کەمیی هاتووچۆ ئاستەنگەکانی تری هاتووچۆ، کە بوونەتە هۆی کەمی تێکەڵاوبوونیان ، ئەوەش بۆتە هۆی پەیدا بوونیچەندان دیالێکتی تر. وەك هەورامی ,لەکی، لووڕی، گەرمیانی و شارەزووری، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەم دیالێکتانەی خوارەوەش گرنگترین بەشەکانن -:

١. دیالێکتەکانی باکوور – ڕۆژئاوای باکوور یا کرمانجی .
٢. دیالێکتەکانی باشوور پێی ئەڵێن کرمانجی باشوور، یاخود سۆرانی .
٣. دیالێکتەکانی باکووری ڕۆژهەڵات ، یا دیالێکتە سۆرانییەکان ئەوانەش :کرماشانی و لەکی .

دیالێکتی سۆرانی، تا ئێستا لە نووسیندا دەستێکی باڵای هەیە زۆربەی نووسینەکانی دەوڵەت ودانیشتوان بەو شێوەیە دەنووسرێتەوە و پیتی عەرەبیی بەکاردێنن ،زۆربەی نووسینە وێژەیی و ڕۆشنبیرییەکان لە کوردستانی عیراق و ئێران بە سۆرانی نووسراونەتەوە پیتی عەرەبی بەکار ئەهێنن بەڵام لە کوردستانی تورکیا پیتی لاتینی بەکار ئەهێنن ، بەڵام لە بەشەکانی کوردستانی ڕووسیا سیرلیکی بەکاردێت (بنۆڕە هاوپێچی ژمارە /٦.(

هۆکارەکانی زمان هەموو کاتێ کاریگەرییەکی گرنگی هەبووە لەسەر نەتەوەی کورد، لەهەموو سەردەمێکداو لە تێکڕای بەشەکانی کوردستان جێگای بایەخدان و خۆشەویستییان بووە ، وەك خۆشەویستی خاك و وڵاتەکەیان. کوردەکان پشتگیری لەوە ئەکەن ،کە کورد بە گشتی ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان هەبووە لەتێکۆشان و هەوڵدانی بەردەوام بۆ پاراستنی زمانەکەیان، کە یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی مانەوەی کورد و کوردستان، تا ئەمڕۆ بەرەنگاری هەموو کێشەکانی بە عەرەب کردن ، بە تورك کردن و بە فارس کردنێك بۆتەوە. زمانی کوردی هەم هێمای بوونی کوردە و هەروەها

باشترین بەڵگەی جیاوازیی بوونی کوردە و ئاشکراو دیارترین بەڵگەی پێناسەی دەست نیشان کردنی پێناسەی گەلە،یا (نەتەوەیی) کوردە. ئەو حکومەتانەی ،کە کورد و کوردستانیان داگیرکردووە ، زۆر بە تەواوی ئاگادارن ، کە زمانێکی گرنگی هەیە هەردەم بەرگری لە مانەوە و پێناسەی کورد و کوردستان ئەکات، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو حکومەتانە بە تەواوی قەدەغەی زمانی کوردی ئەکەن ، یا هەر دان بە زمانی کوردی و خاوەنەکەی دانانێن، یاخود قەدەغەی ئەکەن، یان هانی نادەن و پشتگیری ناکەن، تەنیا حکومەتی عیراق لەبەر هەندێ هۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی زۆر بە هەند و گرنگ هەڵ نەگرتووە لە ژیانی ڕۆژانە و خوێندندا. هەر چەندە دەسەڵاتە ڕامیارییەکان داگیر کەرانی کورد و کوردستان بە بەردەوامی،لەپێناوی تواندنەوەی زمانی کوردی لە هەموو کاتێکدا ئاستەنگیان بۆ دروست کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو بەڵایانە ، کورد توانیویەتی زمانێکی هاوبەشی پرشنگداری هەبێت و بە هێزو توانای خۆی پارێزگاری لێ بکات.

سەرچاوەی :- ( کرینبیرۆك / ١٩٩٢ لاپەڕە ٦٨ . (

زۆربەی هۆیەکانی دابەشبوونی زمانی کوردی بە چەندەها دیالێکتی جۆرا و جۆر لەبەر ئەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ ناتەواویی ڕێگا و بان و هۆکارەکانی هاتووچۆ، بە تایبەتی لە سەدەکانی کۆندا، بەتایبەتی وولاتەکە شاخاوی و پڕ گردو دۆڵە، لەوەش گرینگتر کورد بۆ ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ هەوای سەربەستی و ئازادی هەڵنەمژیوە و هەر لەژێر چەپۆکی داگیرکەرانیدا بووە زۆر بێ بەزەیی و نا شارستانییانە ڕەفتاریان لەگەڵ کراوە ئەوەش بووەتە هۆی لەدەست دانی فەرمانڕەوایی ولەکیس چوونی یەکیەتیی ڕامیاری نیشتمانەکەیان . ئەوەش ئاشکرایە، کە ئەو هۆیانەی باسمانکردن کاریگەرییەکی زۆر گرنگیان هەیە لەسەر ئەگەری یەکگرتنی ڕۆشنبیری هاوبەشی گەلان.هەروەها دابەشکردنی کورد و کوردستان بەسەر دەوڵەتانی تر بە هۆی فەرمانڕەوایی بێ بەزەییانەی ئەوان توانیویانە زمانەکەیان کاریگەرییەکی زۆری لەسەر زمانی کوردی هەبێو هەولیان داوە بیتوێننەوە، کە لە هەمان کاتدا زمانی هاوبەشی کوردیان قەدەغە کردووە وهەموو دەم و بە بەردەوامی سەرکۆنەی کوردیان کردوە و ڕێگاکانی گەشەسەندنیان لێ بریوەتەوە و نەیانهێشتووە زمانێکی هاوبەش بە پێی پێوەرێکی جیهانی دابمەزرێ و خۆی بسەپێنی .

هەرچەندە بە درێژایی سەدەکانی ڕابوردوو هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دراوە لە لایەن تاکە کەسایەتییەکانی کوردەوە ، بۆ دامەزراندن و گەشەسەندنی زمانێکی کوردی هاوبەش بە پێی

پێوەرێکی جیهانی ، بەلاّم بە داخەوە زۆر بە تەواوی سەرکەوتوو نەبوون لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کردن.سەرچاوەی: (مارێن سارلیانین ساڵی 1999 / لاپەڕە/ ٨ .(

کوردەکان زۆر بە شانازییەوە ئەڕواننە زمانەکەیان، کە زمانێکی کۆن و زۆر دەوڵەمەندە، هەرچەندە دوژمنانی زۆر هەوڵیان داوە ، کە زمانەکەیان هەرس بکەن و بیتوێننەوە ولە ناوی بەرن،بەلاّم لەگەڵ هەموو ئاستەنگ و بەلاّو گیرو گرفتە دەستکردەکانی تورك و فارس و عەرەب ، زۆر بە هێز و پڕشنگداری و هاوبەش ،خۆی لەسەر پێ ڕاگرتووەو بەسەر بڵندی ماوەتەوە. بەلاّم لەگەڵ ئەو هەموو ڕووداوانەشدا ,زمانی کوردی وەك سەرچاوەیەکی ڕۆشنبیریی دەوڵەمەندی کورد هەرماوە و خۆی پاراستووە و لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا لەکار گوزاری نەتەوەی کورد دایە،وێژە و زانیارییەکانی کورد زۆر گرنگ و کاریگەرن و دەستێکی بالآشیان هەیە لە چیرۆکە ئەفسووناوییەکان، هەر لە دێرین زەمانەوە،تا ئێستاش زۆر بە ئاسانی ئەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئەفسانە و ڕۆمانەکانی کوردی ، چیرۆکی دوور و درێژی کورد لە زۆر بوارەکاندا، بە تایبەتی سەرگوزشتەی خۆگریی کورد و زمانەکەی بەرامبەر داگیرکەرەکانی وەك عەرەب و تورك و فارس لەسەدەی (١٧) . جگە لەوەش زۆربەی ئەو چیرۆك و ڕۆمانە ئەفسانانە بەشێکی زۆریان بە هۆنراوەی (شیعر)ی ڕەوان و پاراو نوسراوون، کە ئێستاش چێژ و پاراوییەکەیان هەر ماوە. سەرچاوەی) -:عبدولڕەحمان قاسملو / ١٩٦٥ لاپەڕە .(29

## بەشـــی سێیـەم

## ئابووری کوردستـان

3-1 هەرێمی کوردستانی عیراق

مەبەستم لە هەرێمی کوردستانی عیراق ئەو ناوچەیەیە کـە ئەکەوێتـە بەشـی خـوارووی کوردسـتانی مەزن و بە ڕەزامەندی بەریتانیا خراوەتە ژێر دەسـتی عـیراق ,هـەر لـەو کاتەشـەوە بـە کوردسـتانی عیراق ناوزەد کراوە بڕوانە : (هاوپێچی ژمارە ١ (

هەرێمی کوردستانی عیراق (٦) پارێزگای عیراق ئەگرێتەوە لەوانە -:هەولێر – دهۆك – سـلێمانی – کەرکوك – بەشێك پارێزگای دیالە – نەینەوا) موصل).لەبەر ئەوەی ،کە عیراق کوێتی داگیر کرد و، هەروەها لە ئەنجامی شەڕی کەنداو بووەتە هۆی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی کـوردی کوردسـتانی عـیراق لـە ئـاداری / ١٩٩١ هـەر لـە ئـەنجامی ئـەو سـەرهەڵدانەش بەرەیـەکی بـەهێز لـە لایـەن پارتـەکانی کوردستانی عیراق دامەزرا، کە ئەو پارتانەی خوارەوەی گرتە خۆ-:

1- پارتی دیموکراتی کوردستان (پ . د . ك (

2- یەکێتیی نیشتمانی کوردستان ( ی . ن . ك (

3- حزبی شیوعی عیراقی (ح . ش . ع (

4- پارتی گەلی دیموکراتی عیراق (پ . ج . د . ع (

5- حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان (ح . ز . ك (

6- حزبی سۆشیالی کوردستان) پ . س . ك (

7- پارتی سۆشیالی کورد (ح س . ك (

8- بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشووری ( ب . د . ئا (

بەشێکی زۆربەی کوردستانی عیراقیان داگیر کردووە و دەسەلاتێکی باشی دیموکراتییان تێدا دامەزراند.دوای ئەوە حکومەتی ناوەندی دەسەلاتی خۆی لەم هەرێمەدا کێشایەوە بە مەبەستی دروست بوونی بارودۆخێکی بێ یاسایی و بێ کارگێڕی وبێ بەڕێوەبەرایەتی لە هەرێمەکەدا بۆشاییەکی ڕامیاری و نائارامی وا دروست بکات ببێتە هۆی شەڕ و ئاژاوە وپێکدادانی پارتیەکان لە نێوان خۆیاندا و یەکتر بخۆن ولاتەکە وێرانتر بکەن و وایان لێ بکات، کە گەلی کورد بە ناچاری هاتنەوەی ڕژێم بخوازێ وخەوی پێوە ببینێ . هەروەها ئەیویست هەموو پەیمانگا و کارگوزاریەکان لەناو بچن بەلام بە پێچەوانەوە بەرەی نیشتمانی کوردستان، هەر لە سەرەتاوە دەستپێشخەرییەکی دیموکراتییانەی خستە ئەستۆی خۆیو بەئەنجامی گەیاند ,ئەویش هەڵبژاردنێکی ئازادی سەربەخۆ بوو بۆ هەڵبژاردنی دەستەی پەرلەمانی کوردستان بە ئامادە بوونی زۆر لە سیاسەتمەدارانی جیهانی و ئاژانسە مەزنەکانی جیهان و کەسایەتییە گرنگەکانی ناوخۆ و دەرەوەی ولات، جگە لە چەندەها نوێنەری ولاتانی دۆست و پێشکەوتووی جیهانی، بە هاوبەشی هەموو پارت و کۆمەلانی کوردستان ، بەوەش توانی ڕێگا لە ئاواتەکانی حکومەتی ناوەندی بگرێت بۆ هەتا هەتایە. هەروەها حکومەتێکی دیموکراتی لەسەر ئەوبنەمایەی سەرەوە ، بە پێی بڕیاری پەرلەمان دروست بکات، ئەو حکومەتەش ئەزموونێکی دیموکراتی زۆر بەهادار بوو، کە بۆ یەکەم جار نەتەوەی کورد توانی لە ژێر سایەی پەرلەماندا ڕژێمی فیدرالی بۆ کوردستانی عیراق هەڵبژێرێ و لەوە دواش بیچەسپێنێ ، بەمەش بە تەواوی هیوا تراویلکەکانی(سەراب)ی حکوومەتی عیراقی پووچەڵ بکاتەوە، حکومەتی کوردستان پشتی بە ژیانەوە و دروستکردنەوەی ژێر خانی ئابووری و هەوڵی پاراستنی دەسەلات و یاساو ڕێسا ڕامیاری و کۆمەلاتییەکانی زۆر بە پەرۆشەوە دا ، زۆر بە بەردەوامی هەوڵ و کۆششێکی بێ سنووری تەرخان کرد بۆ ئەنجامدانی ئەو شێوە کارانە، لەسەر بنەمای دیموکراتی و بڕیارەکانی پەرلەمان و پێداویستیی هەنووکەیی و درێژخایەنی نەتەوەی کورد و گەلانی کوردستان بە گشتیو بێ جیاوازی، بەم شێوەیەش توانی هەموو ئەو بۆشاییانەی، کە حکومەتی ناوەندی بە کێشانەوەی دەسەلاتی خۆی زەمینە و بارودۆخی دروستی کردبوو، یا بە هیوا بوو کە بۆی دروست بێت بەشێوەیەکی زۆر بلیمەتانە و دیموکراسیانە پڕی کردەوە، کەوای کرد ولاتەکە هیچ پێویستی بە حکومەتی ناوەندی نەمینێ (بنوارە سەرچاوەی (CBSR, P/ 24 : لەگەڵ هەندێ ڕوون کردنەوەی نووسەر.(.

بۆ یەکەم جارلە مێژووی کوردستانی عیراق گەلی کورد هەستی بە بوونی خۆی و دیموکراسی کردو هەوای ئازادی هەڵمژی و پەرلەمانی دامەزراند و بەشێکی زۆری لە وڵاتەکەی ئازاد کرد و لە ساڵی ١٩٩٢ دا یەکەم کابینەی وەزارەتی دامەزراند .ئێستا کابینەی چوارەم دامەزراوە و دەستی بەکارکردوە لە سایەی ئەو کابینەیەشەوە بواری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی گەشاوەتەوە و ورەی هاووڵاتیان زۆر بەرەو باشتر چووەو گۆڕانکارییەکی باشی بەرەو باشتری تێدا ڕووی داوە، بە شێوەیەك، کە بە ئەزموونێکی زۆر مەزن لەلایەن ناوەندە ڕامیاری و ڕۆژنامەوانی دەرەوە و ناوەوە هەژمێر کراوە .

## نەوت و پلەی کاریگەری لە ئاستی ئابووری نەتەوایەتیدا

نەوت ڕۆڵێکی زۆر گرنگ ونائاسایی ئەبینێت لە بواری ئابووری کوردستاندا ، هەروەك لە ژیانی ئابووریی هەموو وڵاتانی بەرهەم هێنی نەوتا ئەبینیٚ بە تایبەتی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا. نەوت ئەو کاتە لەو پەڕی ترۆپکی کاریگەری گرنگی دابوو لە باری ئابووری جیهاندا. جگە لەوەش ، کوردستان کانگای خەلووزی بەردینیشە کە زیاتر لە یەك سەرچاوەی وزە ڕۆل ببینیٚ یا وەك تەنێك یارمەتی کاری ئامێرەکانی پیشەسازی بدات. سەرچاوەی :- (دکتۆر قاسملو لاپەڕە /١٩٨ لە ساڵی ١٩٦٥. )

بە پێی سەرچاوە مێژووییەکانی کوردستان وا دەرئەکەویٚ کە (٥٠٠٠ (پێنج هەزار ساڵ پێش زایین نەوت لە کوردستاندا لە ناوچەکانی کەرکوك، خانەقین و موسل (نەینەوا) دۆزراوەتەوە سەرچاوەی (CBSR)) -:نەوتی کوردستانی عیراق ژمارە /٣٩ لاپەرە /٤.(

نەوتی کوردستان لە چوار وڵاتی ئەوروپایی بەناوبانگ بازار و کڕیاری هەیە، کە ئەوانەش کڕیاری گرنگن، وەك:- فەرەنسا - ئیتاڵیا - هۆلەندا و ئەلمانیا. سەرچاوەی (سامی شەریف لاپەڕە/ ٢ ساڵی / ١٩٧٢. (

کوردستانی عیراق بە شێوەیەکی گشتی گەلیٚ سەرچاوەی جۆرا و جۆری وزەی هەیە ، لە هەموویان گرنگتر نەوتە، هەرە بەناوبانگترین و دەوڵەمەندترین سەرچاوەکانی نەوتی جیهانی لە کوردستاندایە، ئەویش:- ناوچەی کەرکوك - بابا گوڕگور ,کە لە سالی ١٩٢٧ بۆ یەکەم جار نەوتی لیٚ دەرهێنراوە. سەرچاوەی:- (هاوپێچی ژمارە . (2 /ئەو سەرچاوەیەش کەرکووکە کە بە

پێنجەمین گرنگترین سەرچاوەی نەوتی جیهانی ئەژمێرریٚ لە بارەی توانای بەرهەم هێنانەوە.ئەم ناوچەیەش درێژاییەکەی((٦٠ (( میلە لە بەرزاییدایە و پانیەکەشی(٢,٥) میلە،ئەو ناوچەیەش لە ناوەڕاستدا زێی گەورەی پێدا ئەڕوا و ناوچەکە درێژ ئەبێتەوە هەر لە ناوچەی تەرجیلی کەرکوکەوە تا ئەگاتە دیبەگە لە هەولێر (پایتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستان). لەوەش زیاتر دوو ناوچەی تری نەوت هەن ئەوانیش: جامبور ، کە لە ساڵی، ١٩٥٤ نەوتی بەرهەم هێناوە و بیری نەوتی بای حەسەن، کە لە ساڵی ١٩٥٣ وە نەوتی لیٚ دەردەهێنریٚ، کە ئەوەندەش لێك دوور نین. بەشێوەیەکی گشتی سیٚ بیرەکەی کەرکوك قوڵاییەکانییان (١٥٠٠ – ٣٠٠٠ (پیٚیە.

کۆی ئەو بیرانەی لە ناوچەکەدان (٤٤) بیرە ڕێژەی بەرهەمی ڕۆژانەیان(٣٥٠,٠٠٠) بەرمیلە،هەرچەندە توانای هەندیٚ لەو بیرانە بە تەنیا ئەگاتە (100.000) بەرمیل. توانای بیرەکانی ناوچەی کوردستان لەنیوەی توانای بەرهەمی نەوتی عیراقی زیاترە، کە ئەگاتە نزیکەی (١٨٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیون تەن لە ساڵی /١٩٧٩ لە هەمان کاتدا کۆی بڕی پارەکەی گەیشتە (١٨٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیۆن دۆلار لە ساڵی /١٩٨٠ سەرچاوەی (CBSR 1999 -: ژمارە /٣٣ لاپەڕە ٦٢-٦٣ )

## بۆڕییە نەوتە گرنگەکانی کوردستانی عیراق ئەمانەن -:

١. کەرکوك – حەیفا (ئیسرائیل) ئەم بۆڕییەش لە ساڵی ١٩٤٨ لە ئەنجامی شەڕی ئیسرائیل – عەرەب داخراوە، تیرەکەی (٣٠ گرییە) و درێژییەکەی ١٩٩٠ کم .
٢. بۆڕی ترپیپۆلی کەرکوك (لبنان)،ئەم هێلەش بریتییە لە سیٚ بۆڕی بە درێژای (850) کم .
٣. هێلی کەرکوك – بانیاس (سووریا) کە ئەگاتە سەر دەریایی سپیی ناوەڕاست و درێژییەکەشی (٨٨٨) کم .
٤. هێلی کەرکوك – دورتۆل (تورکیا) لەسەر دەریای سپیی ناوەڕاست ، ئەمەشیان لە دوو بۆڕی پێك دێت ، کە تیرەی هەریەکەیان (٤٠ گرێیە) و درێژیەکەشی (١٠٠٥) کم .

جگە لە سەرچاوەی سامانی نەوت، سەرچاوەی گازیش هەیە ،ئەویش بە تایبەتی لە کێڵگەکانی نەوتی کەرکوك و، هەروەها سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی خەڵووزی بەردیش هەیە. سەرچاوەی:– (خشتەی ژمارە/ ٣.(

هەناردنە دەرەوەی نەوتی کوردستانی عیراق لە ساڵی (١٩٣٤) وە دەستی پێ کردوە ، لەو کاتەدا ، کە نەوت بایەخ و کەلکێکی ئەوتۆی نەبوو، سەرچاوە و داهاتەکەی حکوومەتی ناوەندی دەستی بەسەراگرتبوو، هەتا گەلی کورد ڕاوێژیشی پێ نەئەکرا، کە ئایا حکومەتی عیراق بۆ چ مەبەستێ بەکاری دێنێ ، ئەم کێشەیە هەتا ئێستا یەکێ لە کێشە گەورەکانی گەلی کوردە لە گەل حکومەتی عیراقدا، سامان و داهاتی نەوتی کوردستان لەلایەن حکومەتی عیراقەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی هیچ بەشێکی کوردستان بەکار نەهاتووە، بەڵام بە پێچەوانەوە حکومەتی عیراق هەموو کاتێك بەتایبەتی بە درێژایی سەدەی بیستەم هەر خەریکی چەك کڕین و دژایەتی کردنی کورد و هەوڵی توانەوەی ئەو نەتەوەیەی داوە لە نێو بۆتەقەی عەرەبی عیراقدا لەبەر ئەوە هەموو هەوڵێکی دەگمەن و نا هەمواری لەو پێناوەدا گرتەبەر و چەندەها کارەساتی جۆراو جۆری سامناکی بەسەر کورد هێناوە بۆ مەبەستی بە عەرەبکردنی کورد و ڕاگواستنی بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێکان، بەتایبەتی خەڵکی گوندە بە پیت و بەرەکەت و جوانەکانی کوردستان، کە جێگای سامان و خێرو دەرامەتی هەرێمەکە بوون ،خەلکی ناوچەکە زۆر نامرۆڤانە و دڕندانە ڕاگوێزران بۆ کۆمەلگا زۆرە ملێکان لەوێش بێ کارو کاسبی هێشتنیەوە تا کردنیە سووتەمەنی جەنگی عیراق – ئێران ، بەڵام حکوومەتی کوردستان بە پێی بایەخ و پێشەنگی کارەکان دەستی کرد بە دروستکردنەوەی سەرخان و ژێرخانی کوردستان ، بۆ یەکەم جار توانی دەستی بگاتە داهاتی نەوتی خۆی و بە پێی پێداویستییە گرنگەکانی خەڵکی کوردستان خەرجی بکات، ئەویش بەهۆی داهاتی بڕیاری.( SCR/ 986 )

## -3-3چالاکییە بازرگانییەکانی کوردستانی عیراق

بازرگانی ڕۆڵێکی گرنگی هەیە، لەگەشەسەندنی ئابووریی کوردستانی عیراق لە مێژووی هەموو سەدەکانی کوردستاندا، هەروەها کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر پێکهاتەی گۆڕانکارییەکان، ئەمەش تەنیا هەر لە کوردستانی عیراق وا نیە ,بەڵکو ئەم کاریگەرییە گرنگە لە هەموو وڵاتانی دنیا بە هەمان شێوەیە و زۆر پێویستە بۆ گۆڕانکاریی باری گوزەران و دەرامەتی جۆراو جۆری هەموو وڵاتان .

لەبەر ئەوەی باری ئابووری بە بەردەوام لە گۆڕاندایە، ئەوەش لـە ئەنجامـدا بۆتـە هـۆی زۆر بـوونی گۆڕینی پێداویستییەکانیژیان بەبەردەوامی.بەدەنگەوە هاتنی ئەو پێداویستییانەش هـەموو دەمـێ بەهۆی گۆڕانکاری و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو ئاوەدانکردنەوە و گەشەسـەندنەوە پەیـدا دەبـن و لـە زیاد بوون و پەرەسەندن و گۆڕاندان، ئـەویش بـە ڕێگـای بـاری ئـابووری و بازرگانییـەوە چارەسـەر ئەکرێت، جا لەبەر ئەوەش،باری ئابووری بەرەو ئالۆزی و تێکـەڵاوبوون ئەچـێت، هـەروەها کێشـەو ئاستەنگەکانی ڕۆژبەڕۆژو بەردەوامی پتر دەبن، بە شـێوەیەك پـتر بـوونی کێشـەکان بـە ڕێژەیـەکی زۆرتر لە ڕێژەی گەشەسەندنی خودی ئابووریدا خۆی ئەبینێتەوە.

بازرگانی نەك تەنیا هەر لە کوردستانی عیراق، بە ڵکو لە هەموو جیهاندا ڕۆلێکـی گرنگـی هەیـە.ئـەو گرنگییەش بـە پێـی زۆری و چـەند وهەنـد و شـێوە و جـۆری سەرچـاوە ئابوورییەکانییـەتی کـە لـە پارێزگاکانی کەرکوك، دیالە و موسل ناوچەکانی خانەقین و کفری و گەرمیاندا هەن .

ئەم ڕامیارییە دوژمنایەتییەی حکومەتی عیراق بە بەردەوامی ڕەچاوکراوە کات لـە کـات بـە گـەرمتر پەیرەوی ئەکا هـەتا پـاش سـەر هەڵـدانی سـاڵی ١٩٩١ و ئێستاشـی لەگەڵـدابێت هـەر بەردەوامـە و هەموو ڕێگایەکی خراپ و چەوت و چەوێل وخرا پەکاری و کوشتن و بڕین و تۆقاندن بۆ ئەو مەبەستە ئەگرێتە بەر و لەگەڵ شەیتانیش هاریکاری و هەماهەنگی ئەکا بۆ ئەم مەبەستە .

لەلایەکی تریشەوە حکوومەتی هەرێم بە هەموو هێز و توانایەکیەوە ڕۆژ و شەوی خستۆتە سەر یـەك بـۆ ئـەوەی هەماهـەنگی هـەموو پارتـەکان و ئاژانسـەکانی ڕێکخـراوە حکوومـەتی وناحکوومـەتی و دەرەوە و ناوەوە و هەموو کەسانی کورد و ناکورد لەهـەر کـون و قـوژبنێکی جیهـان و کوردسـتانی عیراق کردووە بۆ ئەوەی چی زووە بتوانێ کوردستان ئاوا بکاتـەوە و ژێـر خـانی ئـابووریی وڵاتەکـە دروست بکاتەوە و بار و دۆخێك بێنێتە کایەوە کـە نەتـەوەی کـورد بـە سەربەسـتی و تێـر و پـڕ لـە سێبەری ئاڵای فیدراڵی بە بەختەوەری بژیەت ،هەروەها هەر بەردەوامە لە دروست کردنـی پـرۆژەی کـاتی و درێژخایـەن ، لـەم دە سـاڵەی پـاش سـەرهەڵدانی پـیرۆزی بـەهاری/ ١٩٩١ هـەتا ئێسـتا ,کابینەکانی یەك لەدوای یەکی حکومەتی کوردستان زۆر بە پەرۆشی و دڵسۆزییەوە بەردەوام بوون لەو بوارەدا، کە جێگای شانازی هەموو کورد و هەموو کەسێکەلە هەموو جیهاندا. سەرچاوەی :

((KRG kurdistan reconstruction Raport ,)لاپەڕەکانی 80 – 51)) ساڵی ٢٠٠٠.((

کوردەکان کە بۆیەکەم جار لە مێژووی جیهاندا دەسەلآتی بەڕێوەبردنی خۆیان بە ڕەنج و خوێنی خۆیان دامەزراندوەو بەهەوڵ و هاریکاری نێو دەوڵەتی توانییان خۆیان دەست بەسەر زۆربەی ڕووبەری وولآتەکەیاندا بگرن و حکومەتێکی دیموکراسی و ئەزموونێکی بەرفراوان بێننەکایەوە لە ناوچەکەدا، کە زۆر بەدڵسۆزی چەندەها پڕۆژەی گەورە و بچووکی گرنگ و پێشەنگی بازرگانی و ئابوورییان لە کوردستانی عیراق دامەزراند لە پاش ڕاپەڕینی ئاداری / ١٩٩١ ئەم پرۆژەو هەوڵانە پەرەیان سەند و پاش گۆڕانگارییەکی زۆر لە بواری ئابووری، دارایی،ڕامیاری و بەڕێوەبردنی، کە بە ئەنجام گەیشت لە وڵآتەکەدا .

سەرچاوەی:- ((کولیزار عزیز ،لاپەڕە ١٦٣ ،ساڵی ١٩٩٩.(( A zIz G ,

جگە لەوەش زۆر گۆڕانکاری لە بواری دیموکراسی ولآت بە ئەنجام گەیشتن، هەروەها جموجۆڵێکی گرنگیش لە باری ئابووری و کۆمەلآیەتی ڕووی دا.دەبێ ئەوەشمان لە بیر نەچێت ،کە یەکەی دابەشبوونی جوگرافی سامانەکانیش ڕۆڵی خۆی هەیە لەپێشکەوتنی باری ئابووری و بازرگانی بە پێی دابەشبوونیان بەسەر شوێنە نزیکەکانی سنوورەکانی عیراق، تورکیا، ئێران، سوریا، کە هاوسێی سنووری هەرێمی کوردستانن . هەروەها دابەشبوونی کەرەسەو کالآ بەشێوەیەکی بەکەلك، یابێ کەڵك دیسان ڕۆل دەبینن لەو بوارەدا، کەئێستا زۆربەی پێداویستیەکان و زۆربەی کەرەسەکان لە ولاتەکەدا بەرهەم نایەن لەبەر گەمارۆیUNلەسەر عیراق و کوردستان جگە لە گەمارۆی عیراق کە لەسەر ناوچەی هەرێمی کوردستانی عیراق لەم ماوەی دە ساڵی رابوردووەدا ئەم گەمارۆیانە بەردەوام بوە.

کەرتی بازرگانی لە کوردستاندا ئێستا ڕۆڵێکی زۆر پێشەنگ و قەشەنگ ئەبینێ و بەتەواوی ورێکوپێکی ڕۆڵی خۆی پیادە دەکا.

لە دوای دەست بەکار بوونی بڕیاری نەوت بەرامبەر خۆراك (986) کەرتی تایبەت وهەندێ کۆمپانیای بیانی گەلێ کاری بازرگانییان بە ئەنجام گەیاندووە ، ئێستا پتر لە (١٣) کۆمپانیای بیانی و کوردی لە ولاتەکە بازرگانی دەکەن .سەرچاوە:

)ڕۆژنامەی برایەتی ڕۆژی ٢٠٠١/٨/١٩ ژمارە /٣٤٦٤.(

لەدوایین کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە هەولێر گیرا،ڕاگەیاندنی کۆتایی کۆنفرانسی پارتی دیموکراتی کوردستان بڕیاری دا سیستەمی بازاڕی ئازاد پەیڕەو بکات لە هەرێمەکە دا ، هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کرد ، کە پشتی کەرتی تایبەت بەتایبەتی کەرتی بانك بگرێت لە هەرێمەکەدا.بۆ ئەو مەبەستەش بانکی ناوەندی هەولێری دروست کرد و لەگەل چەندان بانکی تر،هەروەها زۆربەی بانکەکانی تری نوژەن کردەوە و فراوانی کردن ، لە ٢٠٠١/٨/١٦ بانکی ناوەندی ناوبراو لەژێر چاوەدێری نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی کابینەی چوارەمی هەرێم ،ئاهەنگی کردنەوەی بۆ ساز درا.

هەر لە بارەی ئەو چالاکییانەشدا حکومەتی هەرێمی کوردستان(55) پەنجا وپێنج ملیۆن دیناری دایەوە بەو کەسانەی کاتی خۆی،کە حکومەتی ناوەندی پێش ڕاپەڕین بالاْ دەست بوو لەبانکەکان دایان نابوو چ بەشێوەی پاشەکەوت یا بەشێوەی ئاسایی

.سەرچاوەی : ( رۆژنامەی برایەتی رۆژی ٢٠٠١/٨/١٥.(

بایەخی بازرگانی لە کوردستان لەپاش سەرهەڵدانی سالی /١٩٩١ بەبەردەوامی هەر بەرەو پێشەوە چووە.

هەر لەو بوارەشدا ناوچەکە پەیوەندییەکی بازرگانیی فرە چەشنی لەگەل ناوچەکانی حکومەتی عیراق بەستووە ، جا لەبەر ئەوە زۆربەی پەیوەندییە بازرگانییەکان بەقاچاخ ئەکرێن و هەندێکیش وەك هێنانی نەوت وگازۆیل و ....هتد لەرێگای( UN ) وەیە بەشێوەیەکی گشتی هێشتا پەیوەندییەکی بازرگانی هەمەلایەنەیی لەگەل حکوومەتی ناوەندی هەیە و زۆریش گرنگە بۆ هەردوولا.

ئەو چەشنە بازرگانییەش لەپاش داگیر کردنی کوێت لەلایەن عیراقەوە و پیادەکردنی گەمارۆی ئابووری لەلایەن UN وە سەپانرا بەسەر عیراقدا ، ئەوسا ئەو چەشنە بازرگانییانە هاتنەکایەوە ،بەلام لەبەر هۆی ڕامیاری وبەڕێوەبردنی ئەم چەشنە بازرگانییە هیچ زانیارییەکی ورد و پوختەمان لەبەر دەستدا نییە . سەرچاوەی:(لاپەرە :١١٨، ١٩٩٩. ( AZIZ G /

لە دوای ڕاپەڕینی سالّی ١٩٩١ و دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمی کوردستان،کە دەستی گرت بەسەر بەشێکی سنوورەکانی کوردستان بۆ یەکەم جار لە عیراقدا کوردەکان توانییان هەموو

دەسەلاَتێکی خۆیان پیادە بکەن بەسەر هەموو کاروبارێکی بازرگانی خۆیاندا . هەروەها کاروباری خۆیان لەگەڵ ولاتانی هاوسێی خۆیان رێك بخەن و ئالْو گۆڕو کڕین وفرۆشتن ئەنجام بدەن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ،هەروەها لەگەڵ ولاتەکانی ئەوروپا و کوردستانی عیراق بۆتە قوربانی گەمارۆی دووفاقەی( UN) و عیراق بەجووتەو کاریگەرییان کردە سەر ولاتەکەیان بە شێوەیەکی کاریگەر،ئەوەش جگە لە جێگاو شوێنی ستراتیجیو بایەخی پلەی بازرگانیی ئەو هەرێمە،هەروەها ئەو هەرێمە کلیلی بازرگانییە،باشییەکەشی ئەگەرێتەوە،بۆ ئەو دەسەلاتی بەڕێوەبردنە باشەی،کە لە هەرێمەکە حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەیبا بەڕێوە .

)دکتۆر کەمال خەیات ١٩٩٩/ لاپەرە ٢٦-٥٣.(

## 4 – 3بڕیاری سزا ئابوورییەکانی /٩٨٦ ی نەتەوە یەکگرتووەکان-:

لەمانگی /٨/١٩٩٠ ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەولەتی بریاری /٦٦١ ی دەرکرد دژی عیراق بەم کارەش کۆمەڵێ سزای ئابووری بەسەر عیراقدا سەپاند بەهۆی ئەو داگیرکردنە کورت خایەنەی عیراق بۆ ولاَتی کویت.

لە سالی ١٩٩١ بەهۆی هۆکارە مرۆڤایەتییەکانی گەلی عیراق و کارەساتەکانی ،کە بەهۆی سزا ئابوورییە نێو دەولّەتییەکان تووشی هات و چەندەها پێوەر و کێشەی تر سەریان هەلّدا،لەبەر ئەوە دەسەلاتی ( U N) رێگای بە عیراق دا کەبتوانێ برێ نەوتی خۆی هەموو (٦) مانگ جارێك بفرۆشێ بە بڕی (٢ (ملیار دۆلاری ئەمریکی بۆ فریاکەوتن و کڕینی پێداویستییەکانی گەلی عیراق بەگشتی.

بەلام حکومەتی عیراق ئەم بڕیارەی پەسند نەکرد و لەوە دواش بریاری ( ٧١٢٠، 706) لەمانگی (٨، ٩)سالّی ١٩٩١ لەلایەن( U N ) هوە دەرچوون تایبەتی ڕەتی کردەوە .

سەرچاوەی : – (بڕیاری نێو دەولّەتی/نەوت بەرامبەر بە خۆراك – بنۆڕە هاوپێچی ژمارە/٤.(

بڕیاری نەوت بەرامبەر بە خۆراك بڕیارێکی یەکگرتووە،کە لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە دەرچووە،بەمەبەستی چارەسەری کێشە مرۆڤایەتییەکانی گەلانی عیراق،بۆ ماوەیەکی کاتی،کە بۆ پیادە کردن و مانەوەی سزا ئابووریەکانی سەر عیراق،بۆ گەمارۆدانی لە مەودایەکی دیاریکراودا،بۆ پیادەکردنی ئەو مەرجانەی کە لە لایەن( UN )وە بەسەر عیراقدا سەپێنرابوون لە دەرئەنجامی داگیر کردنی کوێت و لەناوبردنی چەکە کۆکوژەکانی عیراق، ئەوەش بووە هۆی گیروگرفتێکی زۆر بۆ گەلی عیراق لە ڕووی ڕامیاریو دەروونیو بازرگانییەوە، ئەو بڕیارە هەموو ئەو لایەنانەی گرتبووە خۆی کە لە سەرەوە باسمان کردن.

حکوومەتی عیراق هیچ هەوڵ و کۆششێکی لە بواری مرۆڤایەتی نەدا بەڵام هەوڵی ئەوەی دا بەباشترین شێوە بەکاری بێنێ بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی و مەبەستی مانەوەی دەسەڵاتی دیکتاتۆری لەجیاتی،چارەسەری کێشە مرۆڤایەتییەکانی گەلانی عیراق،دوا جار نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری / ٩٨٦ی لەباتی ٧٠٦ دەرکرد ، بەلام هێشتا حکومەتی عیراق ئەم بڕیارەشی ڕەتکردەوە وبەرامبەری وەستا تا لە دواییدا پاش ( 5 ) ساڵ بەناچاری ملی ناو لەمانگی / ٥ ساڵی ١٩٩٦ قبولی کرد پاش ئەو هەموو ئەشکەنجەی کەوا گەلانی عیراق چەشتیان ئەوجا قبولی کرد.
سەرچاوەی: -( هاوپێچی ژمارە )( 5 سیامەند بەنا ساڵی /٢٠٠١ لاپەرەی ژمارە/ ٢.(

بڕیاری ناوبراو (١٣ ٪ ) لە پوختەی سامانی داهاتی بڕیاری نەوت بەرامبەر بە خۆراکی تەرخان کردووە بۆ ناوچەی هەرێمی کوردستان بەو مەرجەی ڕاستەو خۆ لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی U)
(Nوهەندێ لە رێکخراوە ناحکوومەتییەکان خەرج بکرێ،لەبوارە مرۆڤایەتییەکانی گەلانی کوردستان بەگشتی،ئەو پێداویستییە مرۆڤایەتییانەش هەرە پێشەنگیان خواردەمەنی و خۆراکە سەرەکییەکانن و هەندێ باڵی تری پێداویستییە مرۆڤایەتییەکانن لە سەرەتای بڕیارەکە بنۆڕە هاوپێچی ژمارە( ١ ) بەلام لەوە دوا لە ساڵی/ ١٩٩٧ ئەو بڕیارە باڵی کێشا بۆ زۆر بەرهەم وپێداویستیی تری مرۆڤایەتی،کەوا بەگشتی ئەم کەرتانەی گرتەوە(خواردەمەنی،کڕین و ئەرکی گەیاندنە دەستی هاوولاتی،تەندروستی، کەرەسە و کالاّی یەدەگی نەوت ناردن و دەرهێنان،کارەبا،ئاو،کشتوکاڵ،پەروەردە،پەیوەندی ناوخۆ و جیهانی تەلەفۆنی و هەموو شێوەکانی تری پەیوەندی،کاروباری گواستنەوە، دروستکردنی خانوو،ئاوەدانکردنەوە،نیشتەجێ کردن و کاروباری ئاوارە و پەناهندەکان (

سەرچاوەی : ( راپۆرتی ( U N )بریاری/٩٨٦ مانگی/ ٦ /ساڵی١٩٩٨، لاپەرە/٦٥.(

لەبارەی کوردستانی عیراقەوە بیرخەرەوەی تێگەیشتن (( Memorandum ) )کە بەشێك بوو لەبریاری /٩٨٦ (نەوت –بەرامبەر بە خۆراك) ئەو بیرخەرەوەی تێ گەیشتنە لەبەشی /٥ لەبەندی /٢٠ کە لە مانگی/٥ سالی/١٩٩٦ دەرچووە ئەلێ (کرینی پێداویستییەکانی هەر سێ پارێزگاکانی هەولێر،دهۆك و سلێمانی لەلایەن ( UN ) وە ئەبێ دابەشکردنی ئەو پێداویستییانە بە پێی هاوپێچی ژمارە /١ی بریاری(نەوت –بەرامبەر بە خۆراك)لاپەرە /٥ ساڵی/١٩٩٦)،بەپێی بڕیاری ناوبراو،ناوچەی هەرێمی کوردستان بەگشتی(١٣٪)ی داهاتی سامانی نەوتی عیراقی بۆ تەرخان کراوە،بۆ دابین کردنی پێویستییە مرۆڤایەتییەکان و نیشتەجێ کردن بنیاتنانەوەی کوردستانی عیراق و ئاوەدانکردنەوەی،کە ئەوەش بەهاوکاری وهەماهەنگی دەسەلاتی ناوخۆی هەرێمی کوردستان لەگەل رێکخراوەکانی ( UN ) و بەهاوکاری تێکڕای هەموو رێکخراوەکانی حکومەتی وناحکوومەتی دەرەوە و ناوخۆییەکان ئەنجام دەدرێت (بڕیاری /٩٨٦ لە سالی /١٩٩٧ لاپەڕە/٢.

بەڕێز دکتۆر شەفیق قەزاز وەزیری یارمەتی مرۆڤایەتی و هاوکاری حکومەتی هەرێمی کوردستان جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە بڕیاری/٩٨٦ پرۆگرامی نەوت بەرامبەر بە خۆراك پرۆگرامێکی زۆر گرنگە بۆ کوردستانی عیراق کاریگەرییەکی زۆری بەسەر ناوچەکەو دانیشتوانی ئێمەوە هەیە زۆر بەکەڵك و بەسوودەو هیواداریین هەر بەردەوام بێت. (

سەرچاوەی :– ( دکتۆر شەفیق قەزاز ساڵی / ٢٠٠١ لاپەرە /٢(

پرۆگرامی بڕیاری ناوبراو لە لایەن( UN) ەوە جێبەجێئەکرێ بەهەماهەنگی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەتایبەتی ئەو مووچەخۆرانەو ئەوانەی چ لە حکومەتی هەرێم کار دەکەن،چ ئەوانەی لەلای رێکخراوەکانی( UN)کار دەکەن هەموو تێکرا هەماهەنگی وهاوکاری ئەکەن لە پێناوی ئەنجامدانی ئەم پرۆگرامە بەرێکوپێکی و سەرکەوتویی.

جگە لەوەش بڕیاری ناوبراو بە بودجەیەکی رێکوپێکی بەردەوام پشتگیری هەرێمەکە ئەکات،لەهەمان کاتیشدا حکوومەتی هەرێم بە هەموو توانایەکی دارایی وئابووری و لە هەموو رێگا دروستەکانی ژیان هەوڵی زۆر باش و سوپاس کراوی بەجێهێناوە بۆ خۆشکردنی ژیانی هاووڵاتییانی گەلانی کوردستانی عیراق بێ جیاوازی و چاکسازییەکی باشیشی وەدەست هێناوە.

هەروەها پرۆگرامی ناوبراو ڕۆڵێکی زۆر گرنگی بەجێ هێناوە لە بواری نیشتەجێ کردن و ژیانەوەو،ئاوەدانکردنەوەی گوند ودێهاتەکانی کوردستانی عیراق،کە زۆربەیان هەر وێران بوو بوون و خەڵکەکانی چ کیمیاباران ، یا ئەنفال کرابوون ، یا(جینۆساید)بەکۆمەل کوژ کرابوون، یاخود بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێکان گوێزرانەوە ئەو ئاوەدانکردنەوەیەی حکوومەتی هەرێم ئەنجامی داوە لەو چەند ساڵە کەمەی رابوردوو بەتایبەتی لە سێبەری کابینەی(٣,٤) حکوومەتی هەرێمدا،حکوومەتە یەك لەدوایەکەکانی پێشووی عیراق لە (٢٠)ساڵی ڕابوردوو نەیانتوانیوە ئەوە بە ئەنجام بگەیەنن،بەم هەموو توانای ئابووری عیراق و لە کاتی نەبوونی گەمارۆکانیش.

بڕیاری ٩٨٦ سالی ١٩٩٥ (نەوت بەرامبەر بە خۆراك) لە کۆتایی ساڵی / ١٩٩٦ دەستی پێکرد وپیادە کرا دوای ئەوەی حکومەتی عیراق و ( UN ) لەسەر درێژەی بڕیارەکەو وردەواتەکانی رێك کەوتن ، ئەویش ئەوەی ئەگرتە خۆ کە مۆڵەت بە حکوومەتی عیراق ئەدات ، کە بایی دوو ملیار دۆلاری ئەمریکی نەوتی خۆی لەماوەی (180) ڕۆژدا بفرۆشی.ئەم سنووردار کردنی بری نەوتە تا ساڵی ١٩٩٨ بەردەوام بوو بەلاّم لە ساڵی ١٩٩٩ ئاسانکاری تر کراو ، ئەو سنووردارییە هەلگیرا و ئاسۆی پرۆگرامەکە لەتەنیا خۆراك ودەرمانەوە گۆڕا بە شێوەیەك کە بوارەکانی تری،وەك گەیاندن و مرۆڤایەتیش بگرێتەوە وەکو دروستکردنەوەی ژێرخانی ئابووری،ئاوەدانکرنەوە هەروەها بوارەکانی پتر کردنی پیشەسازی نەوت.

.سەرچاوەی :- (ڕاپۆرتی (UN) ساڵی ١٩٩٨ لاپەرە /٣ فەیسی ١ لە 10/10/996 وە دەستی پێکرد ولە ٩٩٧/٦/٧ کۆتایی هات.(

لە ٩٩٦/١٠/١٥دا یەکەم بڕی نەوتی عیراق ڕەوانە کرا ، یەکەم دەستەی بەلێندەرەکانی کڕینی نەوتی عیراقی لەمانگی ١٩٩٧/١٢ پێك هاتن و پارەی کڕینەکەیان پێشکەش بە ( UN ) کرد.

لە ٢٠٠١/٦/٣٠ ژمارەی فەیسەکان گەیشتە (١٠) فەیس، دوا فەیس بڕی پارەکەی کردیە ٧١١ ملیۆن دولاری ئەمریکی لە ٢٠٠١/٧/٢٧ .سەرچاوەی ) - : ژمارە قۆناغییەکانی ( UN ) ساڵی /٢٠٠١ لاپەرە/ ١ بڕیاری /٩٨٦.(

لە فەیسی دەیەمی ئێستای پرۆگرامەکە ، کە لە ٢٠٠١/٧/٤ وە بەردەوام بوو تا /٢٠٠١/١١/٣٠ ونزیکەی ٩٦,٣ملیۆن بەرمیل نەوت نێردراوەتە دەرەوە لەڕێگای (دوبەی) کە نزیکەی ٢,١٥ملیار

دیناری عیراقی نرخی فرۆشتنەکەی بووە،ئەمەش ئەکاتە ١,٩٦ملیار دولاری ئەمریکی،سەرچاوەی :- ( ڕاپۆرتی.( (UNOI)(UN)/18 – 24 /8/2001 )

لەم شەش ساڵەی ڕابوردوودا زۆر گەشتیار و میوانی ئەوروپایی و ڕۆژ ئاوا و وڵاتانی تر ڕوویان کردۆتە کوردستانی عیراق وبەچاوی خۆیان دیتوویانە،کەوا پرۆگرامی /٩٨٦ کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و گەلانی کوردستان،لە هەموو بوارەکانی ژیانداو،بەتەواوی دڵنیا بوون لەوەی کەوا ئەو پرۆگرامە کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر ئاوەدانکردنەوەو گەشەسەندنەوەی وڵاتەکە سەر لەنوێ و، لە هەموو بوارەکانی گەشەسەندنەوەی ئابووری و دارایی و ژیانی کۆمەلایەتیی هاوولاتیانی هەرێمەکە بەشێوەی ڕاستەوخۆو گشتی. سەرچاوەی ) -: لۆرد ئەحمەد / دەنگوباسی کوردستان ت.ڤ ئێوارەی /٢٠٠١/١١(

هەروەها پرۆفیسۆر (کارۆل ئۆلێری) کە لە ئەمەریکا و لە زانکۆی "ناوەندی جیهان بەئاشتی بوون کاردەکا" بیرو بۆچوونی وایە : (کە ئەو پارەو پوولانەی داهاتی سامانی نەوتی حکومەتی عیراق هەر لەدێرینەوە تا ئێستا هەر بەشێوەیەکی خراپ بەکاری هێناوە،بەلاَم لە کوردستانا بە پێچەوانەوە زۆر بەرێك وپێکی بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەو دانیشتوانی بەکار هێنراوە). سەرچاوەی : (کارۆل ئۆلێری —ڕۆژنامەی واشنتن پۆست ٢٠٠١/٧/١٥(

کوردستانی عیراق زۆر گۆڕانکاریی جۆراو جۆری گرنگی بە خۆوە دیوە(ح.هـ.ك) داهاتی خۆی هەیە و،داهاتەکانی هەمووی تێکرا بۆ کاروباری ئاوەدانی و دروستکردنەوەی ژێرخانی ئابووری ڕوخاوو و بەرژەوەندی هەنووکەیی و درێژخایەنی خەڵکانی کوردستان بەکار هێناون، ئەو ڕێژە داهاتەی ،کە (١٣٪)ی داهاتی سامانی پرۆگرامەکەی بریاری/٩٨٦،هەموو ئەو کارانەی کە باسمان کردن پێی ئەنجامدراون،ئەویش گرنگی و کاریگەری پرۆگرامەکە لەسەر دانیشتوانی ولاتەکە دەر ئەخا بەڕوون وئاشکرایی بێ ئەوەی گومانێك بهێڵێتەوە.

حکومەتی هەرێمی کوردستانیش داهاتی هەمە جۆرەی خودی هەرێمەکەی خۆی هەیە، بەکاری دێنی بۆ دانی مووچەی کرێکار و فەرمانبەرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان،هەروەها بۆ پرۆژە جۆراو جۆرەکانی،کە پەیوەندی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی بە بەرژەوەندییە هەنووکەیی و ودرێژخایەنەکانی خەڵکانی کوردستانەوە هەیە.

حکومەتی کوردستان هانی سیستەمی بازاری ئازاد ئەداو زۆر چالاکانە پشتی ئەگرێ، چونکە بڕوایان وایە ، کە ئەو رژێمە لەبەرژەوەندی خەڵکانی هەرێمەکەدایە،لەسەرەتای پیادە کردنی بڕیاری/٩٨٦ هەتاکو ئێستا بەشە داهاتی هەرێمی کوردستان لەو داهاتە گەیشتۆتە(٤٤٤٢٠٠٠)دۆلاری ئەمریکی و دابەشکراوە لەنێوان پارێزگاکانی هەولێر و دهوك.

سەرچاوەی :- (چالاکیەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەساڵی/٢٠٠١ / لاپەرە ١(

ئێستا لە هەرێمی کوردستان بایەخێکی زۆر بە کەرتی تایبەت دەدرێت،وە بەهەند وەرگیراوە و لە دوا کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان،کۆنگرەی دوازدەمدا(١٢) باسی لێکراوە و وتووێژێکی تێرو تەسەلی لەسەر کراوە و پشتگیری لێکراوە و ڕۆلی بۆ دابینکراوەو، داوای گەشە سەندنی کراوە .

ئێستاکە لە کوردستانی عیراقدا نزیکەی (٤٣٧) کۆمپانیای ناوخۆ وبیانی هەیە لەوانە (١٩) کۆمپانیای تورکیە ئەوانەش حکومەتی هەرێم مۆڵەتی پێداون.

بڕیاری /٩٨٦ رۆلێکی گرنگی هەیە ، بۆ گەشەسەندنی چالاکیەکانی کەرتی تایبەت ، جگە لە هەموو کەرتەکانی تر .سەرچاوەی :- (خشتەی ژمارە ٤/ ڕۆژنامەی برایەتی ٢٠٠١/٨/١٥ ژمارە ٣٤٦١ – کوردستان(

خشتەی ژمارە /٤-:

ژمارەی مۆڵەتی بریکارەکان /لە بواری بازرگانیلە نێوان سالی ١٩٩٧ 2000–

| ژمارەی مۆڵەتەکان | ساڵ |
|---|---|
| 1053 | 1997 |
| 1975 | 1998 |
| 1973 | 1999 |
| 1062 | 2000 |

سەرچاوەی :– ( بەڕێز نەوزاد ڕەجەب بۆتانی ،وەزارەتی دارایی حکومەتی هەرێمی کوردستان ساڵی ٢٠٠١ – ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە /٣٤٦١ لە ٢٠٠١/٨/١٥ – کوردستان.(

کاردانەوەی ئەم پرۆگرامە زۆر کاریگەری هەیە لەسەر کوردستانی عیراق و لە هەردوولاوە چ لەسەر حکومەتی هەرێم و گەشەسەندنی، هەروەها لەسەر خەڵکانی وڵاتەکەو ئاوەدانکردنەوە وپێشوەچوونی وڵاتەکە،لەم بوارەشدا حکومەتی هەرێم و ئاژانسەکانی حکوومەتی وناحکوومەتی دەرەوە وناوەوە لەگەڵ خەڵکانی وڵاتەکە هەموو تێکرا بەیەك دەست هەماهەنگی و هاریکاری ئەکەن لەو بوارەدا،ئێستا ژمارەیەکی زۆر ڕێکخراوی مرۆڤایەتی لە هەرێمەکەدان کە ژمارەیان (٤٠) ڕێکخراون کە ئەمانەی خوارەوە هەرە گرنگەکانیان:-

| | |
|---|---|
| FAO | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNبۆ کار و باری کشتوکاڵ. |
| UNESCO | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNبۆ کار و باری ڕۆشنبیری. |
| UNCHR | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNدەسەلاتی بالای پەنا هەندەکان |
| UNHCR | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNبۆ نێوەندی مرۆڤایەتی و کاروباری نیشتەجێ کردن |
| UNICEF | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNبۆ پاراستنی مافی مندال |
| WFP | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNبۆ کار و باری خواردەمەنی. |
| WHO | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNبۆ کار و باری تەندروستی. |
| UNOHCT | فەرمانگەی UN بۆ ڕێکخستنی کاروباری مرۆڤایەتی لە عیراقدا. |
| QANDIL | ڕێکخراوی نا حکومەتی جیهانی قەندیل بۆ کار و باری ئاوەدانکردنەوە. |
| SCF – UK | منداڵپارێزی بەریتانی. |
| KRO | ناو خۆیی بۆ ئاوەدانکردنەوە. |
| MAG | بۆ هەڵگرتنەوەی مین. |
| ACRON | ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی UNهۆلەندی بۆ ڕاهێنانەوەی مندالان |
| 4RS | ڕێکخراوی نا حکومەتی بیانی بۆ فریاکەوتن و نیشتەجێ کردنەوە. |

سەرچاوەی :– (بڵاوكراوەی مەكتەبی ناوەندی دیراساتی پارتی دیموكراتی كوردستان، كوردستان CBSR/ژمارە /٣٣ لاپەرە /٧٩ ساڵی /١٩٩٨.(

نۆ وەزارەت لە وەزارەتەكانی حكومەتی هەرێم هاریكاری دەكەن،هەریەكەی لەگەل یەكێ لە رێكخراوەكانی بەرامبەری خۆی كە كاری هاوبەش وهاوتایان هەیە، زۆر بە هاوئاهەنگی وهاوكاری كار پێكەوە دەكەن و بەرپرسیاری سەركەوتنی پرۆگرامەكەیان لەئەستۆی خۆیان گرتووە بەشێوەیەكی هاوبەشی. حكومەتی هەرێمی كوردستان دەیان و هەزارەها فەرمانبەرانی بۆ ئەو رێكخراوانە دابین كردوە، هەروەها كۆگا و پەیوەندیی تەلەفۆنی ناوەوە ودەرەوە بە هەموو جۆرێكی تازە و سەردەم دابینكراوە، ئەوە جگە لە دابین كردنی ئاسایش بۆ هەموو رێكخراوەكان .
سەرچاوەی :(رۆژنامەی برایەتی لاپەرە ٥، ساڵی ٢٠٠١.(

## 3-5چالاكیەكانی هێنان و هەناردنە دەرەوە لەكوردستانی عیراقدا:

## Import-Export in Iraqi Kurdistan Region

لێكۆڵینەوەو توێژینەوەی بوارەكانی بازرگانی و پارە وپول،بایەخێكی بەگورِی هەیە لەسەر وتو وێژی رۆڵی نێوان باری ئابووریدا.

زۆربەی شیكردنەوەی تیۆرەكانی ((Theories )بواری ئابووری تازە لەسەدەكانی هەژدە و نۆزدەی رابوردوودا وتووێژو لێكۆڵینەوەی ئەم شیكردنەوانە لەسەر بوارە بازرگانییە نێودەولەتی و رامیاری پارەداری بوو،هیچ رۆژێكیش هەرگیز لێكۆڵینەوەی بازرگانی جیهانی بەقەدەر ئیمرۆ گرنگ نەبووە و پێش نەكەوتووە.

بازرگانییە جۆراو وجۆرەكانی دەولەتە جیاجیاكان بەرە و یەكتر چوون ئەچن و ووردەوردە جیاوازییەكانیان كەم ئەبێتەوە،ئەوەش لەبەر هۆكاری تێكەلاو بوون و لێك نزیك بوونەوەی گواستنەوەی پارە و كەرەسە وكالا و تەنەكان كە زۆر لێك ئەچن و بەرەو لێك چوونتری زیاتر ئەچن بە بەردەوامی لەسەرتاسەری جیهاندا.

لەپاش راپەرینی بەهاری ١٩٩١ و داگیر كردنی كوێت ودەرپەراندنی عیراق لە كوێت بەشەری كەنداوو داسەپاندنی سزاكانی ئابووری بەسەر عیراقدا،بەهۆی گەمارۆی ئابووری،لەبەر ئەوە

کوردستان بووە تاکە دەروازەی بازرگانیو هاتووچۆی عیراق،دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان ، هەروەها پیادەکردنی بریاری ٩٨٦/ بووە هۆی چەسپاندنی باری ئابووریورامیاریی هەرێمەکە ، لەبەر ئەوە زۆر ئاسۆی تر بۆ بوارەکانی ئابووری وگەشەسەندنی پەیدابوون وهاتنە کایەوە،دامەزراندنی ناوچەی دژەفرینیش لەهەرێمەکە بەتەواوی و سەراپا بووە هۆی چەسپاندنی باری ئاسایش و ئارامیو ئابووری وڕامیاری بەتەواوی لەهەموو ناوچەکەدا و بە بەردەوامی خۆی داکوتا.

ئێستا کۆمپانیا تورکییەکان نەك ،هەر خەریکی کاری بازرگانین ,بەڵکە خەریکی کاروباری هێنانی کەرەسەو کاڵاو دامەزراندنی گەلێ کارگەی بچووکن،جگە لەچەندەها بەرژەوەندی بەربلاوی تر،هەروەها کەسایەتییە بازرگانییەکانی ئێرانیش بەهەمان شێوە و کەرتە بازرگانییەکانی ولاتانی کەنداو جگە لەکاروباری هێنان وناردنی هەمە چەشنەو جۆراو جۆری کالاو کەرەسە و تەنەکان ، زۆر بەسەربەستی هەموویان تێکڕا زۆر بەرێکوپێکی کاردەکەن لەهەرێمەکەدا بە هاریکاری وهەماهەنگی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عیراق.

پاش داگیر کردنی کوێت و،هەڵمەت هێنانی دەوڵەتانی جیهان بە سەرکردایەتی ئەمەریکا و دەرکردنی عیراق لەکوێت،عیراق دووچاری گەمارۆیەکی زۆر قورس بووە بەشێوەیەك کە کەرتی بازرگانیی عیراق بەتایبەتی ناردنە دەرەوە و هێنانی بەجارێ لەپەل وپۆ کەوت و ووشك بوو. پێش سالێ ١٩٩٩/ عیراق (٧٠٪) پێداویستەکانی لەدەرەوە ئەهێنا. سەرچاوە ( عزیز . ج لاپەرە ١١١ سالی ١٩٩٩/ کوردستان. (

سنوورەکانی هەرێمی کوردستانی عیراق چ لەسنوورەکانی تورکیا،ئێران و سوریا، بوونەتە تاکە ڕێگای هاتوچۆ،چ بۆ هاتوچۆی خەڵکی و بۆ بازرگانی وهەناردنە دەرەوە و هێنانی کەل وپەل بەهەموو شێوەکانی ،ئەوەش،بەتایبەتی پاش پیادەکردنی بریاری ٩٨٦/ و تووند کردنی گەمارۆی سەر عیراق،کوردستانی عیراق هەموو کەلوپەلێکی ئەنارد وئەهێنا لە ناوچەی سنووری تورکیا وە لە"ئیبراهیم خەلیلەوە "،کە شارۆچکەیەکی بچووکە لەسەر سنووری (کوردستانی عیراق — کوردستانی تورکیا ) ( بنۆرە نەخشەی ژمارە ١/ کوردستانی عیراق.(

هەرێمی کوردستانی عیراق تەنیا لەسالی ١٩٩٨/ بایی ١٦٤٠,٠٠٠ ملیۆن دینار بە پارەی حکوومەتی عیراق (پارەی چاپ) کەلوپەلی لەحکومەتی ناوەندییەوە هێناوە،ئەوەش هەموو چەشنە

کەلوپەلێکی گرتووتەوە بەتایبەتی نەوت و بەرهەمەکانی و هەموو بەرهەمی هەمە چەشنەی تر .سەرچاوەی : ( عزیز . ج لاپەرە ١٢٦ سالی /١٩٩٩ کوردستان(

بەهەر شێوەیەك و هەرچۆنێك بێت بواری ژیانی خەڵکی و دیمەنی شارستانی هەرێمەکە پاش پیادە کردنی بریاری /٩٨٦ زۆر زۆر باشتر بوو لەپێش سەردەمی پێشوو،و بەردەوام ژیانیان بەرەو باشتر ئەڕوا.

بەکارهێنان و بەردەوام بوونی ئەو بڕیارە ، جگە لەوەش چاکبوونی پەیوەندی حزبەکان بەرەو رێککەوتن و یەکبونیان بەتایبەتی چەسپاندنی ئاشتی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان لەساڵی/١٩٩٦ و وەستانی شەڕ و بەرەو پێش چوونی ئاشتی ڕۆژ بەڕۆژ،ئەم هۆکارەش هۆکارێکی زۆر بە گرنگی کاری کردە سەر باری ئابووری ژیانی خەڵکی و سەر ئاستی بوارە دەروونییەکانی خەڵکی وڵاتەکەو،دیسان بووژانەوەی کاروباری تەندروستی وچالاکییەکانی حکومەتی هەرێم، کە توانی کارو کەرەسەو خەرجییەکانی بەخێرایی بگۆڕێ بۆ کاروباری بنیاتنانەوەی ژێرخانی باری ئابووریو ئاوەدانکردنەوەی ولآت و،جێنشین کردن و بوارەکانی خوێندن و رۆشنبیری..هتد. بەتایبەتی(ح.هـ.ك)کە کابینەی(٣)ی دامەزراند لە ساڵی١٩٩٦ دا،بەڵام چالاکییەکان دوای ئەوەی کابینەی چوارەم لەساڵی ١٩٩٩ دامەزرا بە شێوەیەکی خێراتر پەرەیان سەند .

دیارە پاش ڕووداوەکانی ساڵی , 1996 وە یەکلاکردنەوەی کێشەی ناوخۆی هەرێمی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان بەزووترین کات،وە بۆ ئەوەی هیچ بۆشاییەکی ئیداری دروست نەبێت خۆی سازکرد وە بە هاوکاری سەرجەم پارت و هێزە سیاسیەکانی تری هەرێمی کوردستانی عێراق بۆ دامەزرانی کابینەیەکی نوێی حکوومەتی کوردستان، ئەوەبوو کابینەی (٣)ی دامەزراند لە ساڵی١٩٩٦ دا ، وە بەهۆی بەڕێوەبردنێکی چاك (Management) و پێشکەوتوو و دابینکردنی داهاتێکی بەردەوام لە بڕیاری ٩٨٦ ی نێودەوڵەتی، چالاکییەکان و پرۆژەی بەسوود بەشێوەیەکی خێراتر پەرەی سەند لەو کاتەوە کابینەی چوارەم لە لایان بەڕێز نێچیرڤان بارزانی یەوە لە ساڵی١٩٩٩ دامەزرا.

-

ئاماری ناردنه دەرەوە و هێنان له کوردستانی عیراق بۆ تورکیا:

خشتەی ژماره ٥ : هەناردنه دەرەوەی کوردستانی عیراق بۆ تورکیا 1998– 1997 بەدیناری سویسری عیراقی .

| 1998بەملیۆن دیناری سویسری | 1997بەملیۆن دیناری سویسری | بەرهەم |
|---|---|---|
| 065380 | ---- | خۆراکی خواردەمەنی |
| 000319 | 164 | سەوزە |
| 000954 | 6000 | خورما |
| 006038 | 0026 | ئاسنەواڵ |
| 000063 | 0121 | لۆکه |
| 029390 | 0839 | دانەوێڵە |
| 284079 | 76717 | پێسته |
| 001149 | --- | بەرهەمی کیمیایی |
| 387272 | 83867 | کۆی گشتی |

سەرچاوەی : وەزارەتی دارایی –حکومەتی هەرێمی کوردستان لیستەکانی هەناردنه دەرەوەی کوردستانی عیراق بۆ تورکیا له ساڵانی(١٩٩٧–١٩٩٨ ). دۆلاری ئەمەریکی = ١٨,٥ دیناری عیراقی.

هەروەك دیمان لەدوای /١٩٩٦ و پیادەکردنی بریاری /٩٨٦ گەشەسەندنی ئاوەدانکردنەوە زۆر خێراتر له جاران پەرەی سەند له کوردستانی عیراقدا.(بنۆرە خشتەی ژماره /٦(

)ح ه ك )له /١٩٩٨ بايى نزيكـەى (٢٤٨) مليـۆن دينـارى سويسـرى كەرەسـە  و پێداويسـتى خـانوو كردنى هێناوە بۆ هەرێمى كوردستان.

سەرچاوە ( http//:WWW.Krg.org/contactus.asp١ : )

خشتەى ژمارە ٦ /هاوردەى كوردستانى عيراق(هێنانى) لەماوەى سالانى 1993-1998 بەدينارى عيراقى

| سالّى ١٩٩٨ بەمليۆن دينار | سالّى ١٩٩٣ بەمليۆن دينار | بەرهەم |
|---|---|---|
| 222 | 78,5 | خواردەمەنى خۆراك |
| 49 | 2 | سەوزەوات |
| 3 | --- | گەنم |
| 74 | 73 | خواردنەوەى (كحولى( |
| 75 | 30 | خۆراكى تر |
| 12 | 3 | پێداويستى ناو مالّ |
| 6 | ---- | دارو تەختە |

| پێلاو جلً وبەرگ | 4 | 181 |
| --- | --- | --- |
| ئیلیکترۆنیات | 3 | 150 |
| شووشە و جام | 18 | 89 |
| پارچەی یەدەکی ئوتومبێلً | 7 | 19 |
| توتن | 73 | 442 |
| بەرهەمە کیمیاوییەکان | 3 | 1 |
| گۆشت | --- | 280 |
| کەرەسەی خانو کردن | --- | --- |
| شیر | 1 | --- |
| ڕاخەر(فەرش و مۆکێت وکومبار( | --- | 4 |
| کۆی هەموو | 295,5 | 2269 |

سەرچاوەی :– (ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە /٤٣٦١ – کوردستان(

ئەم گەشە سەندنەی بازرگانی هاوردنە بەجۆرێکی بەردەوام وچەسپاو و وا بەگورج و گۆلً و خێراییە بەهۆی داهاتی بریاری /٩٨٦ و،بە هۆی باشی بەڕێوەبردنی حکومەتی کوردستانی عیراق هاتۆتە کایەوە و بەردەوامە،بەتایبەتی بە هۆی چالاکییە بەردەوامەکانی کابینەی (٣ ، ٤)، کەپاش سالً /١٩٩٦ دەست بەکار بوون.

حکومەتی هەرێمی کوردستان،داهاتی هەناردنە دەرەوەی بۆ ئەوەی خەرجی پارەکانی هاوردنە ناوەوە بدات ، باری ئابووری و کۆمەلایەتی وا پێویست ئەکا ، کە حکومەت وکەرتی تایبەت،هەردوولا پێکەوە هاریکاری وهاوئاهەنگی و هانی هێنانی کەرەسەو پێداویستییەکان پتر بکەن،هەروەها گەشە بە بار و ئاستی گەشە سەندنی ئابووری دابین بکەن بەجۆرێکی باشتر و

ڕێکوپێکتر پێداویستییەکان دابین بکەن،بەتایبەتی بۆ باڵەکانی خانوو کردن، نۆژەنکردنەوە و دروستکردنی کارگە و پرۆژە جۆراو جۆرەکانی تر،هەرێمەکە بڕی(٨٧٨، ٣٨٧)تۆنی کۆی بەرهەمی هەناردۆتە دەرەوە لەساڵی 1998 دا،کە زۆربەی پێداویستییەکانی خواردەمەنی و خۆراك بووە .( بنۆرە – خشتەی ژمارە /٥.(

چالاکییەکانی هێنان وهەناردنە دەرەوەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ڕۆڵێکی زۆر باش ئەبینی لە باری دارایی و ئابووری هەرێمەکە،ئەوەش پێویستی بەوە هەیە کە پلە و پایەیەکی باش وەرگرێ لە پلان و نەخشەکانی و بەنەتەوەیی کردنی پرۆژەکان.

بە شێوەیەکی گشتی، زۆربەی بەرهەمەکان ئەنێرریتە دەرەوە بۆ وڵاتە دراوسێکانی وەکو: ئێران ، تورکیا و سوریا و هەر لەو وڵاتانەشەوە زۆربەی بەرهەمەکان ئەهێنرێنە ناوەوە.

بەرهەمەکانی کوردستانی عیراق،هەروەها ڕووە و وڵاتانی ئەورووپا ئەڕوات.ئێستا لە کوردستان(١٩)کۆمپانیای تورکی هەیە لەهەرێمەکەدا،هەروەها حکوومەتی هەرێمی کوردستان،یارمەتی پێویست و هاریکاری وهاوئاهەنگی هەموو حکوومەت و – کۆمپانیا ئەورووپییەکان ئەکات کە بەرژەوەندییان لە بازرگانی کردن لەگەڵ هەرێمدا هەیە.

## 6—3گواستنەوە و ڕێگاو بانی کوردستانی عیراق

ڕێگاوبانی هەرێمی کوردستانی عیراق ، هۆکانی گواستنەوە لە ساڵی ١٩٩٧ وە زۆر بە چالاکانە پەرەی سەندووە. شارە هەرە گەورە و گرنگەکانی -: هەولێر،دهۆك،سولیمانی، ئاکرێ،زاخۆ و کویسنجق،هەندێ ڕێگای تازە گەورە کراون،ژمارەیەکی زۆریش دروستکراون لەساڵی ڕابوردوودا یاخود ئەم ساڵ ، هەندێکیش دەستییان پێکراوە و هێشتا تەواو نەبوون ،زۆریش لە نەخشەو پلانی دوا ڕۆژدان ، ڕێگایەکی خێراو دوورو درێژ و بەرفراوان هەر لە زاخۆ و شارۆچکەی ئیبراهیم خەلیلەوە تا نزیك سنووری تورکیاوە دەستی پێ‌کردوە.

پاش ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ و دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمی کوردستان،زۆر ڕێگای تازە دروست کرا،بەم هۆیەشەوە گواستنەوەی خەڵك و هاتوو چۆیان،هەروەها گواستنەوەی بەرهەمەکانیان ئاسانکارییەکی زۆری بەخۆوە دی،بێ ئەوەی بەدرێژایی ساڵ توشی هیچ گیروگرفت و ئاستەنگێك بێت.

ئێستاکە بەداخەوە چوونە کوردستانی عیراق لەرێگای ڕاستەوخۆوە نیە بەهۆی گەمارۆی نێودەوڵەتی، بەڵکە : لەرێگای تورکیا ،ئێران و سوریاوەیە .بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەسێکی ئەورووپایی ئەتوانێ لەهەر کون و قوژبنێکی جیهانەوە گەشت بکات بۆ ئەستەنبۆل و ئەنقەرەو لەوێوە گەشتێك بەفرۆکە بۆناوخۆی تورکیا بکات بۆ سەر سنووری توکیا و کوردستانی عیراق بەلاَم پێش کاتی رۆیشتنیان،راوێژ بکەن لەگەل فەرمانگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ولاتەکانی ئەوروپا، کە ئەو کەسە گەشتی لێوە ئەکات بۆ وەرگرتنی رێنمایی و یارمەتی پێویست بۆ گەشتێکی سـەرکەوتوو و ئاسـان.

هەندێ لەناونیشانی نوێنەرایەتییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەدەرەوە:

نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عیراق لە بریتانیا:

KRG- UK

London SW1V-1QB

UK

Tel: 44 2078288616

Fax :44 2078288526

krguk@aol.comEmail:

نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەولاَتانی ئەسکندنافیا :

KRG Representation

Finn boda vagen 2,5th floor

Se 13131 Nacka

Sweden

Phone: : 46 – 8 44 20505

Fax : 46 8 44 20905

Email: Krg Nordic@ telia.Com

http://www-krg/contacus.aspSource:

Representation office in Nordic countries

ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێتی حکومەتی هەرێمی کوردستان،هەموو کات ئامادەیە بۆ یارمەتی دانی هەموو کارێکی بازرگانی، بەتایبەتی کۆمپانیا ئەوروپییەکان، هەروەها هەموو لایەن و کەسایەتیەکان ، تکایە سەیری ئەمە بکە :http://www.krg.org.

بەڵام ئێمە بە باشی ئەزانین ئەو لایانانەی کە ئەیانەوێ گەشت بکەن بۆ کوردستان، پەیوەندی بکەن بە بیرۆی نوێنەرایەتیەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە دەرەوەی هەرێمدا، بۆ ئەوەی چ رێنماییەك پێویستە بیاندەنێ لەگەڵ پێشکەش کردنی هەموو ئاسانکاری و ئەو پێداویستییانەی،کە بۆ گەشتەکەیان پێویستە وەك (ڤیزا وهەر رێنماییەکی پێویستی دیکە) کە زۆربەی زۆری کاری بازرگانی لە سێ شاری حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە ئەوانیش :- هەولێر ، دهۆك و سلێمانی، کە گەشتیش بۆ ئەو شارانە تابلێی ئاسانە.

سەرچاوەی :- (د عەبدوڵا غەفور، جوگرافیای کوردستان، .لاپەرە ٤٣٧- کوردستان /٢٠٠٠(

کۆی داهاتی گشتیی ترانسێتی(ح هـ ك ) لەنێوان هەرێمەکەو تورکیا کە زۆربەی نزیکەی( ١) (٨٤,٨٨٪) داهاتی هەرێمەکەیە ( ٢) ، ئەوەش لەدوای راپەرینی 1991/ وە دەستی پێکرد، کۆی گشتی پارەی ترانسێتی هەرێم لەسالی /١٩٩٨ گەیشتە نزیکەی ١,٩٠٨,٠٠٠,٠٠٠ دیناری عیراقی(سویسری. (

سەرچاوەی : (عزیز ج لاپەرە ١٤١ -کوردستان -تکایە بنۆرە خشتەی حەوتەم ) ١ دولاری ئەمەریکی =١٨/٥دیناری عیراقی(سویسری. (

ترانسێت،کەرتی سێیەمی بازرگانیی کوردستانی عیراقە بۆ حکوومەتی هەرێم،بەلام هەموو سامان و دەستکەوتی ئەو هەرێمە پێش راپەرین راستەوخۆ ئەچووە خەزێنەی حکومەتی عیراقەوە،و ئەویش بە ئارەزووی خۆی خەرجی ئەکرد،بێ ئەوەی پرس و رای کورد وەربگرێ،زۆربەی جاریش ئەدرا بەچەك وبەکار ئەهات بۆ دژایەتی و بۆ تواندنەوەی کوردو لەناوبردنی،وە شایانی شانازیشە بۆ میللەتی کورد لە باشووری وڵاتدا،کە بۆ یەکەمین جار داهاتی وڵات و سامانی کوردەکان بۆ ئاوەدانکردنەوەو بونیاتنانەوەی وڵات بەکار دەهێنرێت،وە کوردەکان دەسەڵاتێکی نیشتیمانییان هەیە.

دیارە هەرێمی کوردستان،پاش ڕاپەڕینیش بووە تاکە دەلاقەی ترانسێت و بازرگانی بۆ حکوومەتی ناوەندیی لەدوای ڕاپەرینی ۱۹۹۱ . بەتایبەتی بۆ خواردەمەنی و دانەوێلە وهەموو چەشنەکانی خۆراك کە زۆر پێویست بوون بۆ بەردەوامی ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ لەو کاتەدا،کە حکوومەتی عیراقی لەهەموو لاوە گەمارۆ درابوو بەپێی بریاری( U N) و هەموو لایەکی لێگیرابوو.( راپۆرتی٩٨٦ /UNSRلاپەرە/٣٣ ساڵی . ( 1998

-

خشتەی /٧ :– لەبارەی هاوبەشی داهاتی ترانسێت لەبازرگانی (ح ه ك ( لەساڵی ١٩٩٣–١٩٩٨

| ڕێژەی% | کۆی داهات بە ملیۆن دیناری عیراقی | کۆی داهات بە ملیۆن دیناری عیراقی | ساڵ |
|---|---|---|---|
| 18ر٥٩% | ٦٠٠ر000/ | 1031/812/000 | 1993 |
| %92 | 115/000/000 | 125/000/000 | 1994 |
| | | | 1995 |
| 88ر٨٨% | 600/000/000 | 675/000/000 | 1996 |
| 46ر٩١% | 000ر٠٠٠ر٤٩٢ر١ | 950ر١٥٠ر١٦٣١ر١ | 1997 |
| %88/84 | 000ر٠٠٠ر٩٠٨ر١ | 2/247/751/000 | 1998 |

سەرچاوەی :– ( ح ه ك – وەزارەتی دارایی ، عزیز .ج ، ساڵی /١٩٩٩ – کوردستان(

زۆربەی ڕێژەی داهاتی دارایی وڵاتەکە،لە گومرگ وترانسێت دەست ئەکەوێ بڕی پارەی چالاکییەکانی(ح.ه. ك ) لە ساڵی /١٩٩٨ /ی ترانسێت گەیشتە 247 , - ملیۆن دینار لەهەموو بەرهەمەکانی کەرەسەوتەنەکان ، کە وەرگیراوون.(سەرچاوەی ) -: عزیز .ج/ لاپەرە ١٣٦/ساڵی ١٩٩٩(

ڕێـژەی زۆری ئـەو داهاتـە بەباشـی خـەرج دەكـرێ،بەتایبـەتی لـەبوارەكانی ئاوەدانكردنـەوە و نۆژەنكردنـەوەی وڵاتەكـە و پـرۆژەی گـرنگ و سـازكردنەوەی ژێرخـانی ئـابووری بـەپێی پـلان ونەخشەیەكی رێك وپێكی ئامادەكراوی پێش وەخت.

## 7—3ئاستەنگ و تەنگ و چەڵەمەكان-:

هەرێمی كوردستانی عـێراق،ناوچـەیەكی جـوگرافی گرنگـی هەیـە لـەبواری بازرگـانی و كۆمەلایـەتی وهەرەوەزی وكاروبـاری گواسـتنەوە، هـەروەها لـەبواری پەرەپێدانی بازرگـانی، لـەدوای راپـەرینی ١٩٩١.بـەرەی نیشـتمانی پارتـەكانی كوردسـتان ( ح . هـ . ك ) ی دامەزرانـد وبەسیسـتەمێكی دیموكراسیو هەڵبژاردنێكی دیموكراسیی وئازادی ئەزموونێكی سەردەمی هێنایە كایەوە، كە جێگای ڕەزامەندی هەموو لایەنەكانی دەرەوەوناوەوە بوو.

سەرەڕای هەموو ئەمانە بەرێوەبردنێكی باشـی هێنایـە كایـەوە،بۆ یەكـەم جاریش كابینـەی ژمـارە یەكیان دامەزراند،جگە لەوانەش ئەم كارانەی كە ئـەنجامیان دا بـەئامادە بـوونی هـەموو نوێنـەرانی حكومەتانی ئەوروپا و ڕۆژئاوا و وڵاتانی دۆست ئامادە بوون و سەرنج و پێشـنیارو ڕێنمـایی خۆیـان لـەپێش و لـە كۆتـایی ئەزموونەكـە لـەبارەی ئەزموونەكـە بەڕاشـكاوی دەربـڕی زۆربـەی زۆریشـی پشتگیری تەواویان لێكرد.

بـەم شـێوەیە كوردەكـان بوونـە خـاوەنی حكوومـەتێكی دیموكراسـیی پەرلـەمانی و دەسـەلاتی بەڕێوەبردن كـە بـە دەسـتی خۆیـان دایانمەزرانـد و لـەخۆیان هـەڵقولابوو، بـۆ مەبەسـت و ئـارەزوو ویستی گەلانی خۆیان.

بـەلاَم لەگـەڵ ئـەم كـارە باشـانەش كـە ئـەنجامیان دا لـە ئاوەدانكردنـەوە و نۆژەنكردنـەوە و گەشەپێدان،وەكو پیشەی هەموو كارو پرۆژە گەورەكانی جیهـانی ، هێشـتاكە ئـەو كارانـە كـارێكی سووك و ئاسان و بێ ئاستەنگ وچەشنەها گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەو بێ كەم وكـووڕی نـەبوون، بەڕاشكاوی هەندێ كەم وكووڕیو گیروگرفت لەنەخشەو پلانەكانی و پیادەیان كـردن و ئەنجامیانـدا بەڕوونی و ئاشكرایی ئەبینرا،چونكە حكومەتی عیراقی بۆ چـەندەها سـالانی ڕابـوردوو(٤٥٠٠) ڕیـێ وێـران كـرد بـوو چ بـە ئـەنفال و كیمیابـاران و كوشـتن و جینۆسـایدو ڕاگواسـتنی دانیشـتوانیان بـۆ

کۆمەڵگا زۆرەملێکانی کە بە تایبەتی بۆی دروست کرد بوون ، بۆ تواندنەوەی نەتەوەیی کورد بەشێوەیەکی زۆر دڕندانەو دیکتاتۆریانە.

هەمان پلان و پرۆژەی بەردەوامی حکومەتی عیراقی لەپاش ڕاپەڕینی 1991/ وە و تائیستاش هەر بەردەوامە بەهەمان ڕێڕەوی بێ ویژدانانە ئەیەوێ بەهەموو توانایەك بەرهەڵستی بوونی کورد بکات .

سەرچاوەی : ( ناوەندی دیراسات ، لاپەرە /١٩٩٩/٢٣ GBSR/لەگەل هەندێ روونکردنەوەی وەرگێڕ(

هەر لەساڵی ١٩٩١ وە پاش دامەزراندنی کابینەکانی ( ح . هـ . ك , ( بەتایبەتی دوای هاتنە سەرکاری کابینەی ((٣)) پرۆگرامی ئێگجار بەئاواتی مەزن و ڕێکوپێك ئەنجام درا.

بەلام وەکو هەموو دەولەتانی جیهان ، حکومەتی هەرێمی کوردستانیش هەندێ ئاستەنگ وگیروگرفتی تایبەتی خۆی هەبوون ،وبەدەستیانەوە زۆر نالاندی،زۆربەشیان کە زۆر گرنگ بوون هەردوو گەمارۆی عیراق و Un ڕۆلێکی گرنگیان هەبوو لە گەورە کردن وهەلاوسانی ئەو گیروگرفتانەو بەردەوام بوونیان،بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ.

دیارە بە شێوەیەکی گشتی،حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەدەست دووچەشنە گیروگرفت و تەنگوچەلەمەو ئاستەنگدا ئەنالێنی،ئەوانەش ڕامیاری وئابوورییە کە زۆر کار دەکەنە سەر ئایندەی کوردستانی عیراق و ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی.

گیروگرفتی ڕامیاری-:

ئاسۆی نادیاری باری ڕامیاریی لەرزۆك و نەچەسپاوی ئاسۆی ئایندەی کوردو کوردستان بەشێوەیەکی گشتی ، ئەمانە هۆکاری زۆر گرنگیان هەیە بۆ دەست نیشان کردنی باری ڕامیاری ئایندەی (ح.هـ. ك ) بەتایبەتی و گەلانی کوردستان بەگشتیو دروست کردووە، هەروەها دیاری نەکردنی پێناسەی ولاتەکەو هاوولاتی و هاولاتیەتی دانیشتوان.

کوردەکان هەر لەمێژەوە و پێش ئیمڕۆش،بەبەردەوامی زۆر بە پەرۆشەوە داوای چارەسەرێکی ڕامیاری ئەکەن،بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ولات و حکوومەت و سنووری ولاتەکەیان،قەوارەی

دەسەڵاتی حکوومەتەکەیان و سنووری جیۆگرافی و شێوەی پەیوەندییان بەحکوومەتی ناوەندیو دەور و بەرو دراوسێ وحکوومەتانی تری جیهان و ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بەشێوەیەکی ڕامیاریو ئاشتییانە. ئێستا بەتایبەتی, کە گۆڕانکارییە زۆر ڕوو ئەدات لە جیهانداو لە حکومەتی ناوەندیو بەتایبەتی لە بواری هاتنە کایەی فەرمانڕەوای تازە لەعیراقدا و لەبواری گەلانی کوردستان،کە ئەیانەوی خۆیان و ولات وحکوومەتەکەیان پارێزراوی بن و هەڵنەپەسێرێن بە نەخشەی بەرژەوەندیەکانەوە جێگەی ڕامیاری مەزندەو بەرژەوەندی و پیلانی کڕین و فرۆشتن و دێرە بەدەرخۆنەی پەیمانە کۆنەکانی ئینگلیزی وەك(سیفەر – لۆزان )ی سەرەتای چارەکە سەدەی نۆزدەهەمی ڕابووردو نایانەوێ ئەم کارەساتانە دووبارە نەبێتەوە،یا وەك دوارۆژی حکومەتی مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٦ نوشستی نەهێنی، کە،یا وەك کوردستانی عیراق لە ساڵی ١٩٧٥ی لێ نەیەت، دیسانەوە تووشی شکەستی و هەرەس بێتەوە کە بووە قوربانی پەیمانی شومی جەزائیر..

ئەمانەش هەر بەدەستەبەرییەکی نێونەتەوەیی داڕێژراو ئەچەسپێ و بەردەوام ئەبێت نەك هەر بەنووسینی ڕۆژنامەکان و دەربڕینی چەندەها وشە و ڕستەی لێپرسراوان ، چونکە ئەمانە هەموو کاتێك بەرژەوەندی بەرپرسانی ئەیانفڕێنێ ، بێ دابین کردنی ئاشتییەکی ڕاستی ڕامیاری ناوچەکە، ئاشتی تێدا ناچەسپێت ، جا لەبەر ئەوە زۆر پێویستە دۆسیەی کوردو کوردستان بخرێتە بەردەست و بەدڵسۆزانە بڕیاری ڕامیاری نێو نەتەوەیی بۆ یەکلا بکرێتەوە و ئەنجام بدرێت و کارایانە وچالاکانە پیادەبکرێت بە ڕوون و ئاشکرایی و ڕاشکاوانە بەشێوەیەکی ڕامیارییانە چارەسەر بکرێت ،چونکە ئەو مەترسیو بێ بڕواییەی ئێستا لەبیرو هۆشی هاوولاتیاندایە بەپێی ئەو ئەزموونانەی کە باسمان کردن چەسپاوە لە مێشکیاندا بێ وەلامێکی ڕاشکاوانە ,کێشەکانی ناوچەکە ، هەر بەرەو گەردەلوول وئاژاوەو دروستکردنی ئاستەنگ و کێشەو چەلەمە ئەمینێتەوەو، ئەبێتە کێڵگەیەکی باش بۆ ئەنجامدانی کارە تیرۆرەکانی حکوومەتی ناوەندی و دوژمن و داگیرکەرەکانی دراوسێکانی کوردو کوردستان بۆهەموو گەلانی هەرێمەکە بێ جیاوازی .

جالەبەر ئەوە ئەبێت پەلە بکرێ لەچارەسەری کێشەی کوردستان بۆ ئەوەی ئەم ئەزموونە دیموکراسیە بچەسپێت و گەلانی ناوچەکە بکەونە ئارامی وخۆشییەکی ڕێك و چەسپاو.

سەرچاوەی :– ( دکتور شەفیق قەزاز – وەزیری یارمەتی ومرۆڤایەتی وهاریکاری(( دکتۆر شەفیق قەزاز – ئەمریکا، وتارێکی ئینگلیزی، لاپەرە ٣ (

بەڕامیارییەکی چەسپاو و ئارام و هەلگرتنی سزا نێو دەولەتییەکانی ( UN) لەسەر عیراق ، کوردستانی عیراق پێشکەوتن وپەرە سەندنێکی زۆر خێرا بەخۆیەوە ئەبینێ ،جگە لەوەش ئەبێتە ناوچەیەکی سەربەست و ئازادی هەموو عیراق وناوچەی رۆژهەلاتی ناوەراست.

ئەم هەرێمە بەم هەموو ئەزموونە دیموکراسییە وگیانی لێبوردنەو،ئەم هەموو پرۆژە و گۆڕانکارییانە زۆر زۆر گونجاوە و شایانی ئەوەیە ,ببێتە ئایندەی ڕووناك بۆ هەموو عیراق و ناوچەکە لەبواری ڕامیاریدا، ئێمە دلنیاین کە دەسەلاتی هەرێم بە بەردەوامی داوای پاراستنی گەلانی کوردستانی کردووە و،ئەوەش هەرگیزاو هەرگیز بەهیچ جۆرێك لەدژی حکومەتی ناوەندیی عیراق یا دەرو دراوسێکان بەکاری نەهێناوە،چونکە کەسێك نییە لەم ولاتە دا بەم شێوەیە بێت یا وا بیر بکاتەوە هەتا ئێستا.

ئەو پاراستنە نێو دەولەتییەی ، کە کورد بەبەردەوامی داوای ئەکاو لەپێناویدا هەموو رێگایەکی ئاشتیانەی گرتۆتە بەر،هەولێ ئەدات تەنیا بۆ دابین کردنی ئەزموونی ئاشتی و دیموکراسی وسەربەستی و ئەم ئازادییە بپارێزێ لەهەموو بوارێکی ئابووری و کۆمەلایەتی و ئاوەدانکردنەوەو نۆژەنکردنەوەو گەشەکردنییان هەمیشە هەر بەردەوام بێت.

<u>گیروگرفتی ئابووری -:</u>

ئاستەنگە ئابوورییەکانیش کاریگەرییەکی خراپیان هەیە لەسەر( ح . هـ . ك) وناوچەکە. بریاری/٩٨٦(نەوت–بەرامبەر بەخۆراك)،ڕۆلێکی زۆر باشی هەیە بۆ چارەسەر کردن و تواندنەوەی بەربەست کردن و بەرەنگار بوونەوەی کێشە ئابوورییەکانی کوردستانی عیراق.تەنیا بە (١٣٪)ی داهاتی ئەو پرۆگرامە لە داهاتی نەوت کاروبارێکی زۆر ڕێك وپێك و بەکەلك ئەنجام دراوە بەشێوەیەکی گورج و گۆلێ و خێرایانە،لەوانەش ئاوەدانکردنەوەو،نۆژەنکردنەوە لەهەموو بوارەکانی کاری ڕۆشنبیری،کۆمەلایەتی،و دروستکردنی قوتابخانەوخانوو،نەخۆشخانەو کەرتەکانیپیشەسازی وکشتوکال وبەنداوەکان و، ئاوی خواردنەوەو،کارەباو،رێگاوبان وهاتووچۆ هەموو ئەمانە گۆڕانکاری و پێشوەچوونێکی باشییان بەخۆوە بینیوە.

پێویسته (ح . هـ . ك ) ژێر خانی ئابووریی ( هـ . ك ) زۆر بەرێك وپێكی و بەپەلە دروست بكاتەوە و پەیوەندییەكانی زیاتر بەرفراوانتر و بەربلاو بكات لەگەڵ جیهانی دەرەوە و رێكخراوی كۆمەڵەی نێودەولەتیو دەرو دراوسێكانی بەبەردەوامی و كۆڵ نەدات،تا ئەگاتە ئامانج .لەسەری پێویستە هاریكاری و هەماهەنگییەكی زۆر بەگوورو بەتێنتر بكا، لەگەڵ هەموو لایەنانەی باسمانكردن لەپێناوی دارشتن و ئەنجامدانی چاكردنەوەی ژێرخانی ئابووریی هەرێمەكە.

پێویستە، ئێمە ئەوەمان لەبیر نەچێت ، كە ( ح . هـ . ك ) یاهەر لایەنێكی تر ناتوانی هەتا هەتایە هەر پشت بەهاریكاری وهەما هەنگی و یارمەتی نێودەولەتی و داهاتی (١٣٪)ی پرۆگرامی سامانی نەوتی عیراق ببەستیٚ ، كە ئەوەش بەستراوە بەو بڕیارە نێونەتەوەیەی دژ بە دەوڵەتی عێراق سازكراوە، چونكە ئەم بڕیارانە كاتین و بەرنامەو سەرچاوەیەكی بەردەوام نین هەتا هەتایە.

جا لە بەرئەوە،ئەبیٚ زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵ بدات كە سیستەمی ئابووریی كشتوكاڵی و پیشەسازی و وزەو گەشتیاری و كۆمەلایەتی و زانستی وا دابنیٚ و پیادە بكات،كە بە بەردەوامی و چەسپاوو بە جۆرێك بێت ئەو بۆشاییە پڕكاتەوە ،كە لە ئەگەر بڕیاری /٩٨٦ وەستا ، بتوانێت كاروباری ولاتەكە لەئێستا باشتر بەڕێوە بەرێت بۆ ئەوەی جێگەی دەست و توانای(ح . هـ . ك ) دەر بكەوێت.

سەرچاوە :ـ (بەڕێز مەسرور بارزانی ـ كوردستان نیوز ( بە زمانی ئینگلیزی ) لە پەرلەمانی كوردستان دەردەچێت ، سالی /٢٠٠١ ژمارە /١٢ كوردستان(

دیارە ئاشكرایە كە بڕیاری نێونەتەوەیی ٩٨٦ SCR/پرۆژەیەكی بەردەوامی هەتا هەتایە نیە جا لەبەر ئەوە،زۆر پێویستە،كە حكومەتی كوردستان،هەر لە ئێستاوە خەمی ئەوە بخوات كە ئەو بۆشاییەی پاش هەلگرتنی بڕیاری /٩٨٦ ڕوو ئەدات بەتەواوی پڕی بكاتەوەو پێویستە،چالاكانە ڕەچاوی ئەو خالانەی سەرەوە بكات كە باسمان كردن،هیچ هۆ و بیانوویەك نابیٚ ببێتە هۆی پشت گویٚ خستنی ئەو خالانەی زۆر بە پەرۆش و زانایی و لێهاتوانە جێگاو بۆشایی پڕ بكەنەوە.

كوردستان ولاتێكی دەوڵەمەندەو پڕە لە زۆر سەرچاوەی كانزایی گرنگ ،جگە لە نەوت، وەكو : خەڵوزی بەردین ، سەرچاوە ئاو،سەرچاوەی گەشت وگوزار،كەرەسەی خاوی زۆر جیا جیای كشتوكاڵی،پیشەسازی و مەڕمەر و بەرد و دار و.... هتد

لەوانـە گـرنگتریش ئەوەیـە کەدانیشـتوانی وڵاتەکـە بـەتێکرایی هەسـت  بەتوانایـەکی بـەردەوام و چالاکییەکی بەهێز ئەکەن بۆ ئاوەدانکردنەوە و نۆژەنکردنەوە  و دروستکردنەوەی ژێرخانی ئابووری و پاراستنی وڵاتەکەیان ، بەشێوەیەکی ماندوونەناسانە،کەهـەرگیز لـەو پێنـاوەدا بـیر لەبەسـەرهاتە کۆنەکانیان ناکەنەوە  بەشێوەیەك ببێتە ئاستەنگ لەو ئاسۆیەدا،جالەبەر ئەو هۆیانەیـە،کـە ئـەتوانن خۆیان تا سەر بەرێوەبەرن و ئەزموونەکەیان سەرکەوتوو دەبێت ،ئەتوانن ئەزموونەکەیان لە هەموو ڕوویەکەوە فراوانتر و بەرەوپێش بەرن لەژێر هەموو بارو دۆخێکدا.

داڕشتنی پلان و نەخشەی ئایندە لەبوارە ئابوورییەکانیشدا باشترین  تاکـە ڕێگەیـە بـۆ دەسـتە بـەر کردنی تەواوی ئەو مەبەستانەی سەرەوە بۆ دابین کردنی ژیانی باشی وڵاتەکە.

حکوومەتی هەرێمی کوردستان بـاش سـەرکەوتووە ، تائێسـتا لـەپیادەکردنی نەخشـە و پلانـەکانی بەشێوەیەکی سەرەکی لـە بـواری دروسـتکردنەوەی ژێرخـانی ئـابووری و هـەروەها بـۆ بـارووددۆخی داهاتوو و پاشەڕۆژی هەرێمی کوردستانی عیراق و پاش بڕیاری نێو دەوڵـەتی ژمـارە ٩٨٦ SCR/لـە کوردستانی عیراقدا نەخشەو پلانێکی زۆر باشی لەبەردەستدایە.

# به شی چوارەم

**فەرهەنگی بازرگانی کوردستان**Business Culture in Kurdistan:

به شێوەیەکی گشتی کوردەکان،ڕەگەز و،زمان،هەڵسوکەوت،داب ونەریت،مێژووی دێرینی زۆر جیاوازە لەگەڵ عەرەب و گەلانی ولاتانی دەرو دراو سێ و ولاتانی جیهان،له بەر ئەوەی لەخێزانی گەلانی هیندۆ – ئەوروپی هاتوونەته ئاراوه و دابەزیون ، جا لەبەر ئەو هەموو جیاوازییە جۆراو جۆرانه ، هەمووی تێکرا کار دەکەنه سەر پێکهاتەی داب و نەریتی بازرگانی و کاروبارەکانی ، کە پابەندە بە ئابووری و پرۆژەی بازرگانی.

کورد گەلێکی ڕۆژهەلاتین ، ئەوان ڕێڕەو و ڕێبازێکی جیاوازی خۆیان هەیە بۆ بەرێوەبەردنی کاروباری ئابووری ، بەتایبەتی لەبواری بازرگانیدا هەر لەدەسپێکردنەوە تا بەئەنجام گەیاندنی و پیادەکردنیەوە.

جا لەبەر ئەوە، سەرنجی ئەوە ئەدەین بە ئاشکرا و ڕاشکاوی هەندێ جیاوازی ئەبینین لەو بوارانەی سەرەوە، کە لەگەڵ کوردێك بازرگانی دەکەی،لەگەڵ یەکێ لەگەلانی تر،بەتایبەتی لەگەڵ بازرگانەکانی گەلانی دەرو دراوسێ، باشتر وایە بازرگانە ئەورپاییەکان ئەوە بزانن کە خەڵکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەبێ فێری ئارام گرتن بن،کوردەکان بەگشتی زۆر بە ڕیزەوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ بەرامبەریان وەدی دێنن، بەشێوەیەکی گشتی کاروباری بازرگانی هەواڵی کۆبوونەوە و کارە گرنگەکانی پێش وەخت ئاگادار ئەکرێ،بەشێوەیەکی زۆر بە ڕەو شت و خوویەکی بەرزەوە،زۆربەی کارەکانیش و هەڵسوکەوتی بازرگانی لێك ئەچن وەك هەر ولاتێکی تر،جا لەبەر ئەوە ڕێز و ڕەوشت و گیانی برایەتی و هەماهەنگی وهاریکاری لەنێوان بازرگانە کوردەکان،وەك هی ولاتانی تر وایە،ئەگەر زۆر باشتر نەبێت، هەروەها لە بواری شارەزایی و ڕێنمایی پەیوەندی باش بەشێوەیەکی بەرز کۆبوونەوەکان لەلایەن بازرگانە کوردەکان بەڕێوە دەچن.

لەدوایی ڕاپەڕینی ١٩٩١ و بە دیمۆکراسی کردنی کۆمەڵگەی کوردی لە کوردستانی عیراقدا،زۆربەی بازرگانە کوردەکان ئەتوانن بە گەلێك زمانی بیانی کاروباری بازرگانی و پەیوەندییەکان و شێوەی کارەکانی خۆیان بەچاکی بەئەنجام بگەیەنن،بەگشتی کوردەکان وەرگێر (مترجم) بەکار ناهێنن یا

زۆر کەم ، کاتێ کە لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکان کاروبار ئەنجام ئەدەن ، چونکە زۆربەیان عەرەبی ، فارسی , تورکی و ئینگلیزی قسە دەکەن.

لەڕاستیدا زانیارییەکی کەم هەیە لەبارەی زانیارییە بازرگانییەکانی کوردستان،لەبەرئەوەش پشتم بەستووە بە ئەزموون و زانیاری تایبەتی خۆم لەو بارەیەوە.

## 4 – 1 کۆبوونەوە بازرگانیەکان

ئەوەی زۆر گرنگە،کەوا بخرێتە ڕوو،ڕێز لێ نان و بەخشندەیی،کە زۆر پێویستە بۆ هەردوولایەن،بۆ ئەوانەی کە کۆ ئەبنەوە بەمەبەستی پەیوەندی و کاروباری بازرگانی لەلایەن کوردەکان بەئاشکراو لەسەر ئاستێکی بەرز هەموو کاتێك بەخشندەیی و ڕێز لێ نان بەردەوامە،هەرچەندە لەوانەیە کە هەموو نەیەتە دی بە پێی یاساو ڕێسا بازرگانییەکانی سەردەم وە تۆ مەبەستتە، بەڵام لەهەموو کاتێکدا کارو پەیوەندیەکان باش ئەنجام دەدرێن.

لەکوردستانی عیراق ، کۆبوونەوە بازرگانییەکان بە بەشێکی گرنگی کارە بازرگانییەکان ئەبینرێن،ڕوانگەی تێبینی کوردی بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژهەلاتیی،لەبەر بارو دۆخی کوردستانی عیراق،گەمارۆی ئابووری نێودەولەتی و گەمارۆی عیراقی لەسەر هەرێمی کوردستانی عیراق ، جگە لەهۆی گەمارۆی نێو نەتەوەیی لەسەر عیراق خۆی.

جا لەبەر ئەوە،دەکرێ کارو پەیوەندییە بازرگانییەکان بێ کۆبوونەوەی ڕوو بەڕوو ئەنجام بدرێن بەپێی بنەماو پرەنسیپەکانی پەیوەندیی بازرگانی،تایبەت بە ناوچەکە وەك پێویست لەسەر ئاستێکی زۆر تەواو وبێ کەم و کووڕی، لەڕاستیدا کوردەکان لەهەرێمی کوردستان،کەوا ژمارەیەکی زۆر پەیوەندی و پەیمانی بازرگانییان هەیە لەگەڵ زۆر وڵاتانی دەرو دراوسێی خۆیان و هەندێ وڵاتی تری عەرەبی وەك و بەحرەین ، ئیماراتی عەرەبی ، تورکیا و هەندێ وڵاتانی ئەوروپایی ڕۆژهەلات و ڕوسیا..

ئەم پەیمانە بازرگانییانە هەر هەموویان بێ کۆبوونەوەی ڕوو بەڕوو بە ئەنجام گەیشتوون.هەموو یاساو ڕێسا بازرگانییەکان لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە دەستیان بەسەرا گیراوەو بەرێك و پێکی بەڕێوە ئەبرێن و ڕێك ئەخرێ و بە ئەنجام دەدرێن و پیادەکردنی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و یاسایی وەدی دێن و دەستەبەرە ئەکرێن.

حکوومەتی هەرێم بەتەواوی ئەو ڕێگەو یاسا و ڕێسایانەی ,هێناوەتە کایەوە کە بریاری سزاکانی ۹۸٦/ پیادەیان ئەکاو بەشێوەیەکی تەواو جێ بەجێیان ئەکات.

بەڕێوەبەرایەتی (ڕەسمی) یارمەتییەکی زۆری هەموو کۆمپانیاکانی کەرتی گشتی و تایبەتی ئەدات.سیستەمی ئابووری حکوومەتی هەرێمی کوردستان،سیستەمێکی تێکەڵاوە (System Mixt),بەڵام ئەوەش بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی هاووڵاتییانی وڵاتەکەیە، وە بە بۆچوونی ئێمە ناکرێت لە بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستانی عێراقدا،ڕێگاو فوورسەتێکی زۆر گەورە بدرێتە کەرتی تایبەت، لەبەر ئەوەی هێشتا کوردستان لە قۆناغێکی گوونجاودا نیە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی زۆر گەورە بدرێتە کەرتی تایبەت،دەبێت کەرتی گشتی سەروەر بێت.

حکومەتی هەرێمی کوردستان، دەسەلاتێکی کەمی هەیە لەژیانی ئابووریی لەکوردستانی عیراقدا، چەندان پشووی ڕەسمی و نارەسمی هەن"ڕۆژەکانی پشووی ڕەسمی"، کە بازرگانەکان پێویستە بەهەندی وەربگرن ، کاتێ ئەیانەوێ کۆبوونەوەی بازرگانی ئەنجام بدەن،چونکە لەو ڕۆژانەدا لەوانەیە هەموو چالاکییە بازرگانییەکان بووەستێنرێن و دەرگای دام و دەزگاکانیش دا بخرێن،بەتایبەتی ڕۆژانی هەینی و هەندێ ڕۆژ و بۆنەی تر. جگە لەوەش هەندێ داب ونەرێت هەن،کە پەیوەندییان بە ئاهەنگ و ڕۆژانی یادەوەری و پشوودانەوە هەیە،پێویستە ئەو ڕۆژانە بزانرێت بۆ ئەوەی تووشی هەڵە و گێروگرفت و خراپ تێك گەیشتن نەبن،بە زانینی داب ونەریتی بازرگانی چوارچێوەیەکی ڕێزو خۆشەویستیش بۆ خۆت وئایندەی کاروباری بازرگانی پێك ئەهێنێ.

گرینگترین پشووەکان و بۆنەو یادەوەریەکان و ناوی ڕۆژەکانی بیرەوەری و ئاهەنگ و پشوو ڕۆژانی جەژنە نەتەوایەتی و ئاینییەکان،زۆر پێویستە لە لایەن بازرگانەکان بزانرێ چونکە بەزانینیان ئاسانکارییەکی زۆر بۆ بازرگانەکان بەرچەستە ئەبێت .

## نەورۆز:-

گرنگترین یادی میللەتی کوردە،مانای ڕۆژی تازەیەو ڕۆژێکی نەتەوایەتیی زۆر بەنرخ و بەڕێزە لای گەلی کورد لەهەموو پارچەکانی کوردستان , هەروەها کوردەکان لە هەر کون و قوژبنێکی جیهان بن،یادی ئەوڕۆژە ئەکەنەوە و ئاهەنگی خۆشی و شادی بۆ ئەگێڕن لەو ڕۆژانەشدا کاروبار ئەوەستێ و دام و دەزگا حکومەتییەکان دائەخرێن.

نەورۆز گرنگترین ڕۆژی ساڵانەی کوردە ، ئەو ڕۆژە یادەوەری  ساڵانەی سەری ساڵی تازەی کورد،لەیەکەم ڕۆژی بەهار دا کە ئەکەوێتە (٢١) ئاداری هەموو ساڵێك نەورۆز دەست پێ ئەکا بۆ ماوەی (٣) ڕۆژی یەك بەدوای یەکدا . ئێران پەیرەوی ڕێگا و ڕێبازی ئیسلامی ئەکا لەبواری بۆنەو جەژنەکانی ڕۆژانی ساڵ.

ئەوجەژنەی نەورۆز لەساڵی ٦٢٢ی پێش زایینی دەست پێ ئەکا  سەرچاوەی :( ساریلاینین مەڵی،لاپەرە ١٥ ساڵی ١٩٩٩ (

## ڕۆژەکانی هەینی:

کوردەکان هەفتەی کارکردنیان (٦) شەش ڕۆژە،دوا ڕۆژی هەفتە ڕۆژی  هەینییە،هەینیش ڕۆژی پشووی حکومەتییە.بەلام بۆ کۆبونەوەی بازرگانی و ئەنجامدانی پەیوەندییە بازرگانییەکان لەو ڕۆژە دا ئەتوانرێ زۆر بە ئاسانی و ڕێك و پێکی وەکو هەموو ڕۆژە ئاساییەکان چالاکی ئەنجام بدرێ بەڕێکەوتنی لایەنەکانی ئەو کارە  بەپێی ڕێکەوتنی لایەنەکان.دەکرێ هەموو ئەو کۆبوونەوانەی پێویستن لە نووسینگەی بازرگانەکان ئەنجام بدرێن.

## ڕۆژی یادەوەری یا بیرەوەری ساڵانە -:

کوردەکان چەند ڕۆژێکی بیرەوەری سالانەیان هەیە کە زۆر بەرێزو پەرۆشەوە یادی لێ ئەکەنەوە هەموو ساڵێك لەهەموو کون و قوژبنێکی جیهاندا  بەدرێژایی مێژوویی ئەو ڕوودانە لەو ڕۆژە مێژوییانەش وەك، یادەوەری شاری هەڵەبجە ، کەلەو ڕۆژەدا شاری هەڵەبجە کیمیا باران کرا لەلایەن رژێمی سەدام   حسێنەوە لەڕێگای فرۆکەو هالێکۆپتەرو سەربازو سەرکردە سەربازییەکانی،کە بۆتە  هۆی کوشتنی (٥٠٠٠) پێنج هەزار منداڵ و ژن و گەنج و پیری بێ تاوان هەر لەپێناوی مانەوەی دەسەلاتی دیکتاتۆری خۆی،هەروەها بزرکردنی( ٨٠٠٠ )هەشت هەزار هاوولاتی بارزانی کە هەتا ئەمرۆکەش ( ٢٠٠٢ ) بەبێسەرو شوێن،.جگە لەوەش ڕۆژی ئەنفال،کەئەویش جەرگ بڕتر بوو لەو ڕۆژەدا (٠٠٠ ر١٨٢) سەدو هەشتا و دوو هەزار کوردی بێ تاوان بەپیر و گەنج و

مندالّ ونێر و مێیەوە لەناوبراون لەژێر گلا بە شۆفل و گرێدەر بەبێ سەرو شوێن شاررانەوە،کە تائیستاش کوردەکان نازانن ئەو کوردانە لە کوێ لە چ ناوچەیەك ژێرگلّ خران لەلایەن سوپای عیراقیەوە و حکومەتی عیراقیش،هەتا ئێستاش و لەهەموو گفتوگۆیەکدا ئەوەی ڕەتکردۆتەوە،کەوا هیچ زانیارییەك لەو بارەوە بدات بەکوردەکان،بەهیچ شێوەیەك،یا بە هیچ لایەنێکی تر،جگە لەوەش هەزاران دێی تری وێران کرد،کەنزیکەی (٢٥٠٠) دیێ لەو هێرشەدا وێران کردو نزیکەی دوو هەزاریشی لەهێرشەکانی چەند سالّی لەوە پێشتریش وێران کردبوو،بەم ژمارەیەش ژمارەی دێیە وێران کراوەکانی کوردستانی عیراق گەیشتە (٤٥٠٠)چوار هەزارو پێنج سەد دێ،جگە لە سەدان ناوچە و باخ و باخات و سەرچاوەکانی ئاو و ئابووری و ڕەزی وێران کرد و هەروەها دەستی کردبە چاندنی نزیکەی (٢٠) ملیۆن مینی جۆرا و جۆری بۆ کوشتنی کورد و ئاژەلی کوردەکانی کوردستانی عیراق چاندوە و چەندان هەزاریشی لێ کوشتوون بە مین.یادی رۆژی ڕاپەرینی ئاداری ١٩٩١/ هەموو سالّێك زۆر بەخۆشی ئەکەنەوە.

## 4 – 2 – داب ونەریت و بنەما و شێوازەکان

### 4 – 2 – 1 ناونیشانەکان:

کۆمەڵگەی کورد بۆ داب و نەرێتی بازرگانی ڕۆژئاوایی واز لەداب ونەرێتی کوردانەی گرنگی خۆی ناهێنێ،چونکە ئەمانە زۆربەی کارەکانیان بێ پلان و نەخشەو ڕاستەوخۆ ئەنجام ئەدەن و زۆربەی پەیوەندی و کۆبونەوەکان و کاروبارەکانی بازرگانی ڕاستەوخۆ لەلایەن سەرۆکی یاخاوەنی،یا بەڕێوەبەری گشتی پرۆژەکان , کارگە،کۆمپانیاکان نووسینگەکانی ، کۆمپانیە بازرگانییەکانەوە بە ئەنجام ئەگەیەنرێن.

### 4 – 2 – 2 ڕووشکاندن

ئەوە زۆر گرنگە،کە هەرگیز ڕووی هیچ کوردێك لە پێش چاوی خەڵك نەشکێنی و توانج و پلاری تێ نەگری یا گاڵتەی پێ نەکەی،بۆ ڕیسواکردنی لە بارەی بیرو بۆچوونەکانییەوە،یاخراب تێ گەین.

کاتیَ هەڵەیەك لە کوردێك ئەبینی لەڕووی هەندیَ بابەتەوە ڕاستەوخۆ مەیدەوە بە چاویدا،بەلاَم بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ،ئەتوانی ئاگاداری بکەیەوە بە ئاماژە کردن بۆ ئەو بابەتانە و چارەسەرێکی مام ناوەندی بۆ بدۆزەوە کەبیَ ئارەق کردن،کێشەکە چارەسەر بکرێت،بۆ وێنە ئەگەر هەڵەیەك ڕووی دا لەبەر هەندیَ هۆ ئەو لایەنەی هەستی پیَ ئەکا،ئەتوانیَ بە ناراستەوخۆ ئامۆژگارییەکانی دەربڕیَ بۆ ڕاستکردنەوەی کێشە و بابەتەکە،بیَ ئەوەی کەس تەریق بکاتەوە،با هیچ لایەنێك هەست بەوە بکات،لایەنەکەی بەرامبەر گاڵتەی پیَ ئەکات بەتایبەتی لە بەرامبەر خەڵکی تر.

## – 3 – 4ڕۆڵی ئافرەتی کورد ﴿ پلەو پایەی مێینەی کورد لە کۆمەڵدا[

لەپاش ڕاپەڕینی مانگی ئاداری بەهاری ساڵی ١٩٩١ و پاش دانانی یاسایەکی تازە لەلایەن کوردەکان بۆ دەستنیشان کردنی مافەکانی ئافرەتی (مێینەی ( کورد، کارێکی زۆر پێویست بوو بۆ گەشەکردن و برەو پێدان و پترکردنی ئەو مافانەیان بە بەردەوامی لەناوکۆمەڵگای کوردەواریدا ، کە بگونجیَ لەگەڵ سەردەمی ئەمرۆدا و مافەکانی ئافرەتانی کوردستان گەیشتوونەتە قۆناغێکی تازە و بەشێکی زۆری مافەکانی خۆیان و ئازادییان مسۆگەر کردووە ، بەدرێژایی تەمەنی کابینەکانی حکومەتی کوردستان ژن وەزیر بووە،پلەو پایەی بەرزیان هەبووە ئافرەتی کورد ڕۆڵێکی زۆر گرنگی بینیوە لەپێك هێنان و گەشەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵگەی کوردەواریدا،هەروەها شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی،کە لەپێناوی ئازادی و سەربەستی کورددا ئەنجام دران, ئافرەت بە بەردەوامی هاوبەشی کردووە.

ئیمرۆ ئافرەتی (میَینە) کورد ئەبینیَ بەچەند داب و نەریتێکی کۆنی بیَ کەڵك کۆیلەکراوە و پێویستە لەسەر (ح . هـ . ك) هەموو ڕێکخراوەکانی ناوخۆی کوردستان،بە بەردەوامی بۆ مەبەستی لەناوبردنی ئەو کۆیلەیەتی و دابە کۆنانە تێبکۆشن.

ئافرەتی کورد ئەمڕۆ لە کوردستانی عیراقدا ژمارەیەکی زۆر زۆریان ڕۆڵێکی گەورە لە بەڕێوەبردنی دام و دەزگاکانی (ح . هـ . ك ) وەکو مامۆستای هەموو قۆناغەکانی قوتابخانە و زانکۆو ئەندازیارو،پارێزەر،هەروها گەلیَ کاری گرنگی تر دەگێڕن،ئەوە جگە لە بوارەکانی کۆمپیوتەر و ئەنترنێت.

بەڕاستی (ح . هـ . ك ) زۆر بایەخ ئەدات بەبواری پەروەردەو،ڕۆشنبیریی ئافرەتی كورد و گەشەسەندنی ئەو ڕۆلە و بینینی ، هەروەها لەبواری دارایی و كۆمەلایەتی و ڕێكخراوەیی و بۆ فێربوونی سوود وەرگرتن لەبوارە كۆمەلایەتی و داراییەكان و چونیەتیی خۆرێكخستنی ئافرەتان لەناو كۆمەلّدا بۆ ڕێكخستنی ڕێكخراوی جیا جیای پابەند بە خۆیان و چالاكییەكانیان،ئێستا لە كوردستاندا زۆر ڕێكخراوی ئافرەتان هەیە كەچەندەها چالاكی جۆراوجۆریان هەیە هەر لە ڕۆشنبیری و هونەری و ڕامیاری و كۆمەلایەتی وخێرخوازی ومافەكانی مرۆڤایەتی،بەتایبەتی ئەو ڕێكخراوانەی،كە پابەندن بە خودی ئافرەتان خۆیان...... هتد.

لە كوردستاندا ئێستا زۆر ئافرەتی كورد ئەندامن لەڕێكخراوە جیهانییە بەرزەكان و هاوكاری و هەماهەنگییەكی زۆر پتەو ئەكەن شان بەشانی پیاوانی كورد ، ئەوان تێ ئەكۆشن لەپێناوی بە ئەنجام دانی كارگوزاریی باش بۆ بەرچاو خستنی ڕۆلی ئافرەتی كورد لەهەموو دام و دەزگاكانی ناوخۆ و جیهانیدا و ڕۆلێكی بەرچاویان هەیە لەپەرلەمانی كوردستاندا.

ئێمە ئەگەر بە ویژدانەوە ڕۆلی گرنگی ئافرەتی كورد لە كوردستانی عیراقدا بەراورد بكەین لەگەلّ دەرو دراوسێكانا وەكو ولاتانی ﴿ عیراق . توركیا . ئێران ﴾ ئەبینین ئافرەتی كوردی عیراقی زۆر پێشكەوتوو تر و زۆر چالاكترە و بەرهەمی زۆرتر و پوختتری هەیە.

بە شێوەیەكی گشتی پاش ڕاپەرینە پیرۆزەكەی بەهاری سالی ١٩٩١ و دامەزراندنی (ح. هـ.ك) ئافرەتی كوردستان بەشێوێكی زۆر بەرچاو و مەزن پێشكەوت وە ئەو پێشكەوتنەش بەردەوام گەشەی سەند، بەلّام بە شێوەیەكی گشتی لەهەموو كوردستاندا ئەگەر ژیانی كۆمەلایەتی بەراورد بكەین لەگەلّ پێشكەوتنی كۆمەلّگەی پێشكەوتووی جیهانی ئەوا ئەبینین كۆمەلّگای كورد هێشتا زۆر دوا كەوتووە.

هۆی ئەم دوا كەوتنەش بەتایبەتی ئەگەڕێتەوە بۆ نەچەسپاوی ڕامیاری،بێ ئارامی و بێ ئاسایشی ناوچەكەو،جگە لەهەندێك هۆی ئاینی،هەروها چەندین داب و نەریتی كۆن و بێ كەلّك،دوو گەمارۆی كوشندە،ئەمانە تێكڕا كاریگەرییان هەیە بەسەر كۆمەلّگەی كوردەواریدا لە زۆر دەمێكیشەوە بەزۆر داسەپێنراون،جگە لە بوارو ئاستەنگە ئابووری و دارایی و بیرو باوەڕی ئاینی.

## 4 – 4 پەیوەندییە بازرگانییەكان لە كوردستاندا-:

پەیوەندییە بازرگانییەکانی کورد وەکو هەموو کاروباری بەشەکانی تری کوردستانی عیراق تازەترین هۆکاری پەیوەندییان هەیە و گۆڕانکارییەکی زۆر ڕووی داوە لە سەرجەم بوارەکانی پێگەیشتن و پەیوەندی کردنەوە،هەر لە سەرەتای ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی سالی ١٩٩١ وەو پاش دامەزراندنی(ح .هـ.ك) بایەخێکی زۆری بەم بوارە داوەو شۆڕشێکی سەردەمانەی لەبواری پەیوەندییەکانی ناوەوە دەرەوە بە ئەنجام گەیاندوە.

## 1 – 4 – 4نامە ناردن بۆ کوردستان:

ئێستا لە کوردستاندا کار گوزاری نامە ناردن لە ناوەخۆ بەڕێك و پێکی بەڕێوە دەچێت ، هەروەها ڕۆژانە کوردستانی عیراق بەستراوە بەڕێگای گواستنەوەی تورکیا لەوێشەوە بۆ هەموو ولاتانی جیهان.

بۆ ئەوەی نامەی بازرگانی،یان هەر جۆرە نامەیەکت هەبێت بتەوێ بگات بە بازرگانی کورد یان کوردێکی ئاسایی زۆر بەئاسانی ئەتوانێت لەم ڕێگایەوە بیگەیەنێتە هەر بازرگانێکی بیانی لەهەر ولاًتێك بێت.

هەروەها بازرگانە بیانییەکان ئەتوانن نامەکانیان ڕەوانە بکەن بۆ بازرگانە کوردەکان لە هەر شوێنێکی کوردستان بێ لەو ڕێگەیەی کە باسمان کرد و ناونیشانێکی تایبەتی هەیە لەتورکیا بۆ ئەم مەبەستە .

لەهەموو ولاتانی ئەوروپا و ئەمریکا و یان هەر ولاتێکی ترەوە دەتوانیت نامە بنێریت بۆ کۆمپانیاو بازرگانەکانی کوردستان یان هەر کەسێکی ئاسایی:

KRG-Habur

P.O.Box 4- 33

Sirnak- Silopi

Turkey

پاش ئەوەی ئەو ناونیشانەی سەرەوە،ناونیشانی ئەو کەسەی یان ئەو کۆمپیانیای مەبەستتە بە ڕوونی بە زمانی کوردی یان عەرەبی ئەنووسی، لە کارە گرنگەکانی (ح.هـ.ك) لەم بوارەدا ئەوە بوو،کە پوولی پۆستەی کوردی دروست کرد،جگەلە پوولی دارایی و خستیانە بازارەوە،ئێستا بە شێوەیەکی ئاسایی بەکاردێت لەکوردستاندا ﴿تکایە بروانە هاوپێچەکان [

## 2 – 4 – 4تەلەفۆن و فاکس-:

ئێستا لە کوردستانی عیراقدا تەلفۆن و فاکسیش بە بەردەوامی شەو و ڕۆژ لە هەردوو کەرتە گشتی و کۆمپانیا تایبەتییەکاندا کار گوزاری پێشکەش بە هاوولاتییانی ناوەخۆو بیانی ئەکەن، بەشێوەیەکی زۆر ڕێك و پێك لەسەر ئاستێکی سەردەمی تازە و بە تازەترین ئامێری تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن و پەیوەندی کردن.

کار گوزاری تەلەفۆن وفاکس لە کوردستاندا زۆر هەرزان و ئاسانە هەموو دەم دەست دەکەوێت

لەڕاستیدا زۆربەی پەیوەندییە گرنگەکانی بازرگانی کورد و کۆمپانیاکان لەنێوان ئەوان و کۆمپانیاو بازرگانییە بیانیەکانەوە لەڕێگای تەلێکسەوە ئەنجام دەدرێت.

لەپاش ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی نەورۆزی ساڵی ١٩٩١ وە ،هەموو پەیوەندییەکی کوردستان لەگەل جیهانی دەرەوە دایە و لەگەڵ کۆدی عیراقدا پەیوەندی نییە،بەلاّم ئەتوانین لەڕێگەی کۆدە جیهانییە گرنگەکانی :– بەریتانیا – سوید – ئەمریکا .... هتد پەیوەندی بکەین.ئەم کۆدانە لەبواری ئابووریدا زۆر هەرزانترو کەمتری تێ دەچێت لەبەکارهێنانی کۆدی نێودەوڵەتی عیراقدا .

## 3 – 4 – 4ئەنتەرنێت:

لە کوردستانی عیراقدا ئەنترنێت لە پڕ و بەخێرایی پەیدابوو و گەشەی سەندو بەکارهێنانی بەرەوپێش چوو، هەر چەندە ئەنتەرنێت بەزمانی ئینگلیزی بوو ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە نەبووە ئاستەنگێکی گرنگ لەبەردەمی کورد چەندەها مەڵبەندی ئەنتەرنێتیان دامەزراند ڕۆژانە سەدان پەیوەندیو ئیمەیل بەهۆی ئینتەرنێتەوە ئەنجام ئەدرێن،زۆربەی بازرگانەکانیش ئینتەرنێتیان هەیە،زۆربەی کوردەکانیش ئینگلیزی ئەزانن.ئەوەی لە کارەکانی ئێنتەرنیتیش کە زۆر بەکاردێت ئیمەیلە.

له كوردستاندا گەلێ سەنتەری ئینتەرنێت هەیە لە کەرتی تایبەتدا،بەڵام سەنتەری ئینتەرنێت هێشتا زۆر گەشەی نەکردووە لەهەرێمدا،بەڵام کەرتی تایبەت و کحومەتی هەرێم خەریکن لەمەودوا گەشەی پێ بدەن.

لە وڵاتێکی وەك كوردستان کە دوو گەمارۆی مەزنی لەسەرە لەگەڵ چەندان وڵاتی دراوسێی دوژمن،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا ژمارەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت ئەگاتە زیاتر لە(٥٠٠٠) کەس ئەو ئینتەرنێتەش،هێشتا زۆر گران بەهایە،چونکە لەرێگای مانگە دەستکردو سەتەلایتەوە بەکار دێت،جگە لە وەش بەکارهێنانی رۆژ لە دوای رۆژ لە پەرەو گەشەسەندندایە .

سەرچاوە : (کەریم زێباری – کوردستان نوێ ژمارە –١٣ لاپەرە – ٣ , ساڵی ٢٠٠٠(

هەرچۆنێکی لێی بکۆڵیتەوە باری کاروباری ئەنترنێت لە کوردستاندا لەزۆر دەوڵەتانی دراوسێ ئاسانترو هەرزانترە و بەئاسانیش دەست دەکەوێت وە زیاتریش لەپەرەسەندن و پێشکەوتندایە.

لەکوردستانی عیراقدا ژمارەیەکی زۆر کار لەبازرگانی کۆمپیوتەر ئەکەن ئەم بازرگانییە لەپڕ پەیدا بوو زۆر بەخێرایی پەرەی سەند و پەرەسەندن وپێش کەوتنیشی بەردەوامە.

گەلێ کۆگای کۆمپیوتەر لەکوردستاندا ئەبینین چەندەها جۆری کۆمپیوتەری تیادا هەیە، ئەوە هەروها چەندها بنکەی فێرکردن و بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بلاو بۆتەوە چەندان بازاڕ و کۆگا هەن بۆ فرۆشتن و کڕینی ئامێرەکانی کۆمپیوتەر و پارچە یەدەگەکانی،کە زۆربەی زۆری کەرتی تایبەت ئەم کارە دەکات،ئەم بازرگانەش بە بەردەوامی لە پەرەسەندن و پێشکەوتندایە،ڕوویەکی گەشی پێشکەوتووی داوە بە کوردستان.

سەرچاوە : ( سهام مەمند – کوردستانی نوێ ژمارە ١١ سالی ٢٠٠٠.(

هەرێمی کوردستانی عیراق لەو بوارە دا ئیستا لە زۆر ولاتانی دونیا پێش کەوتوو ترە.(ح .هـ.ك) زۆر پرۆژەی لەو بابەتەی لەبواری ئابووری دا لەسەرجەم بوارەکانی تردا یارمەتی دارایی داوە پشگیری لێ کردوون.زۆربەی زانکۆکان و دامودەزگا گرنگەکانی( ح . هـ . ك )و ڕۆژنامەو گۆڤارەکان و پارت و رێکخراوەکان،جگە لە کۆمپانیا و بازاڕو کارگەکان ژمارەیەك کۆمپیوتەری خۆیان هەیە ئەوەش جگە لە هەندێ فەرمانگەی تایبەتی و چەندان دام ودەزگای ڕاگەیاندن.

## بەشی پێنجەم

## 5-1سەرنج و پێشنیار

لە کوردستانی باشووردا،وە پاش ڕاپەرینەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ی پیرۆز و دامەزراندنی (ح.هـ.ك) زۆربەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی کوردستانی عیراق کەوتە ڕێگای وڵاتە دراوسێکانی،لەبەر ئەوە ئەرکی ئەستۆی(ح.هـ.ك) بوو،کە زۆر بێ وچان هەوڵ بدات بۆ دۆزینەوەی بازاری تازە بۆ بازرگانیی کوردستان لە هەموو کون و قوژبنێکی جیهاندا لە ئەوروپا ، ئەمەریکا بۆ بازرگانیکردن و دانانی کارگە و پرۆژەی بەکەڵك،کە ڕووی پێشکەوتوویی وڵاتەکە زیاتر گەشە پێبدەن و ئەم هەرێمە تازەیە هەلێکی باشی ڕەخساندووە بۆ ڕێگادان بە ناردنی،بەرهەم و کاڵا و کەرەسەی باشتر و زۆرتر بنێرنە دەرەوە بۆ وڵاتانی وەك ئەوروپا،بەتایبەتی سکاندیناڤیا و،ئەمەریکا و هەموو وڵاتانی جیهان.پاش لێکۆڵینەوە و تێڕامانێکی تەواوی بواری ئابووری هەرێمی کوردستان ، وە بە مەبەستی زیاتر خزمەتکردنی ئەزموونە دیموکراسیەکەمان و بەهێزکردنی ژێرخانی ئابووری وڵات و زیاتر خزمەتکردنی نیشتیمانەکەمان،ئەم پێشنیارانەی خوارەوە بخەینە بەردەستی بەرپرسانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان،بەهیوای ئەوەی کە کەڵکی لێ وەربگیرێ:

- پیادە کردنی بڕیاری ٩٨٦ زۆر گرنگە بۆ کوردستانی عیراق،پێویستە بەشێوەیەکی چەسپاو بەردەوام بێت . ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ، پێویستە زۆر بایەخ بەو خاڵانە بدات کە پابەندن بە گەلی کوردەوە بەبەردەوامی داوای ئەوە ئەکا و بێ وچان لەپێناویدا تێ ئەکۆشێ بۆ چەسپاندنی بەشی تەواوی کوردستان لەداهاتی نەوت،هەروەها پێویستە بواری ڕامیاریی ئاسایش وئارامی زۆر بەشێوازێکی چەسپاو بەردەوام بێت،بواری دارایی و ئابووریش پێویستە بە بەردەوامی چەسپا و بێت دوور بێت لەهەموو هەڵتەکاندنێك، بەشێوەیەکی باش دابین بکرێت،لەمانەش هەمووی گرنگتر مسۆگەر کردنی بەردەوام بوونی پیادەکردنی بڕیاری ٩٨٦ ، پێویست حکوومەتی کوردستانی عیراق ئەو ڕێژەی داهاتی نەوتەی،کە (١٣٪) داهاتی نەوتی هەموو عیراقە بە بەردەوامی هەبێت لەپاش لابردنی گەمارۆی سەر عیراق ولابردنی سزا نێودەولەتییەکان ڕێژەی بەشی داهاتی کوردستان بەجیاوازی بمێنێ و تەنیا لەڕێگای ( UN) وە،یا لەڕێگای (ح.هـ.ك) وە لە کوردستانا خەرج بکرێت،یاخود بە هەماهەنگی هەردوو لا. ئەوە کارێکی ئاشکرایە، کە بەردەوام بوونی مانەوەی بە تەواوی ڕێك

وپێکی ئەو بەشە داهاتەی کورد ئەبێتە هۆی بەردەوام بوونی ئاسایش و رامیاری هەرێمەکە،ئەوەش لەخواستە گرنگەکانی گەلانی کوردستانە زۆر بە پەرۆشەوە داوای ئەکەن لەپێناویدا بێ وچان تێ ئەکۆشن، ئێستا بەتایبەتی لەجیهانی بازرگانی و سیستەمی گێتیدا بەرێوەبردنی باش، تاکە هۆکاری کلیلی هەرە گرنگی سەرکەوتن و گەشەسەندنی کاروباری دارایی ئابووری هەموو ولاتانە .

- هەروەها لە کوردستانی عیراقدا بەهەمان شێوە بۆ ئێمەش ئێستا پێویستە،هەر کۆمەلێك بەرپرسیارە،کە بریاری کارو باری بەرێوەبردن دابرێژێ،پێویستە ئەو خالانە رەچاو بکا،کە سیستەمێکی بەرێوەبردنی ( Management )ی باش بۆ کارو بارەکان مسۆگەر بکات بە بەردەوامی و هەموو دەم لەپێناوی گەشەسەندنیدا تێبکۆشێ بۆ هێنانە کایەی پەرەپێدان و گەشەسەندنێکی باشی پرۆژەی ئابووری و کۆمەلایەتی .

- دامەزرانی وەزارەتێکی تایبەت بە دارشتنی نەخشە و پلان و ئامارەکان زۆر پێویست و گرنگە لەهەرێمی کوردستانی عیراقدا، چونکە ئێمە بێ زانیاریی و ئاماری پێش وەخت و دارشتنی نەخشەی رێك وپێك ناتوانین وا لەپرۆژە ئابوورییەکانمان و باری ئابووری خۆمان بکەین کە رۆلێکی گرنگ وتەواو رێك و پێك و بەرهەمدار وەدێ بینین .

-هەر لەسەرەتاکانی سالێ ١٩٩١وە هەرێمی کوردستانی عیراق پەیوەندییەکی بازرگانی تازەی بەکارهێناوە لەهەرێمەکەدا لە بازرگانی ناوخۆ،هەروەها لە بازرگانی و ئالو گۆری دەرەوەدا،لەبەر ئەوەی کە کوردستانی عیراقیش،وەك هەموو ولاتێکی تر گیروگرفتی ئابووری هەبووە، لەو گیروگرفتانەش کێشەی پارە بووە، ئەوەش ئێستا ئەوان پارەی دیناری سویسری بۆ ئالو ویری ناوخۆ بەکاردێنن ودۆلاری ئەمریکیش بۆ بازرگانیی دەرەوە بەکاردینن ،هۆی گرنگ و بەکەلکیان هەیە بۆ بەکارهێنانی دۆلاری ئەمریکی ، چونکە دۆلار پارەیەکی جیهانییە و بنەماو هێزێکی ئابووری بەردەوامی هەیە و هەموو ولاتان ئالوگۆری پێ ئەکەن.

-بریاری ٩٨٦ نێودەولەتی،بریارێکی زۆر گرنگە بەتایبەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشە کشتوکالییەکانی کوردستانی عیراق،ئێمە دەتوانین بەهۆی ئەوەوە چارەسەری کێشەکانی هەناردنە دەرەوە بکەین و هەروەها گەشەو برەو بەم بوارە بدەین، ئەم هێزی پاراستنی نێودەولەتییە، کە

ئارامی خستۆتە ناوچەکە، هەروەها ئەم پشگیرییە ئابوورییانە بە یەکەوە بۆ نەتەوە هۆکارێکی بە کەڵك لەم بوارەدا ئەگەر بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بێت و بزانین و بتوانین بەرێگەیەکی باش بەکاری بهێنن، لەو ڕێگایانەش :– دۆزینەوەی بازاری تازە ، ولاتی تازە بۆ بازرگانی وەك لە ولاتانی ئەوروپا ، ئەمەریکا و رۆژئاوا و جگە لە هەموو ئەو ولآتانەی کە ئێستا بازرگانییان لەگەڵ ئەکەین.

-ئێستا لە کوردستاندا زیاتر لە( ٩) رێکخراوی شارەزای تایبەتمەند هەن،کە ڕاستەوخۆ سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکانن لەژێر چاودێری ئەوان کاردەکەن ئەمانە پرۆژەکان دەست نیشان دەکەن هەموو پشتگیرییێکی ئابووری بۆ دابین دەکەن ئەو رێکخراوانە بە هاوکاری و هەماهەنگیی بەڕێوەبەرایەتیی(ح.هـ.ك) کارەکانیان ئەنجام دەدەن بەپێی بەرنامەی بڕیاری/ ٩٨٦، جا لەبەر ئەوە زۆر پێویستە ئێمەی کورد ئەمڕۆکە لە هەرێمی کوردستانی عێراق ، کەڵك لە زانیاری و ئەزموونەکانیان وەربگرین بۆ ئەوەی ئێمە لە ئایندە دا جێگای بەرنامەکانی بڕیاری/ ٩٨٦ بگرینەوە ,کاتێ ئەوان کاریان کۆتای پێ هات و لەدوا ڕۆژدا بۆ ئەوەی هیچ بۆشاییەك دروست نەبێت (ح . هـ . ك) سەرجەم کارەکان بکات وەکو پێویست و بێ گیروگرفت.

-دیارە بایەخدان بە کەرتی تایبەت مەسەلەیەکی زۆر سوودبەخشە،هەموو ئەزموونەکان ئەم ڕاستیەیان سەلماندووە،بەڵام باروودۆخ و قۆناغی ئەمڕۆکەی کۆمەڵگای کوردستان ناتوانێت بەرامبەر خواست و دەسەڵاتی کەرتی تایبەتدا مامەڵە بکات، وە دەسەڵاتی دارایی و ئابووری حکوومەتی کوردستان پێویستە زۆر ئاگاداری ئەم لایەنە بێت و هەوڵ بدات کە ئەم کەرتە باڵادەست نەبێت لەبواری ژیانی ئابووری‌دا،ئاستی گووزەرانی هاوڵاتییانی کوردستان پێویستی بە پشتگیری و هاوکاری کەرتی گشتی (حکوومی) هەیە. دەکرێت کەرتی تایبەت دەسەڵاتێکی سنووورداری هەبێت،بەڵام دەسەڵاتی بەهێز هەر دەبێت لە دەست حکوومەتی کوردستان بێت.

- لە دوونیای ئەمڕۆدا مەسەلەی ئامرازەکانی گوواستنەوە و ڕێگاوبان (Logistics ) زۆر گرینگە بۆ بازرگانی نێودەوڵەتی. وە بە مەبەستی بەرەوپێشبردنی ڕەووتی بازرگانی و پێشکەوتنی ئابووری هەرێمی کوردستانی عێراق، دەکرێت پلان بۆ هەندێك پرۆژەی گرینگی لۆجستیکی دابڕێژرێت، واتە درووستکردنی ڕێگاوبان و پردو ئاوەدانکردنەوەی ئەو خاڵە سنوورییانەی نێوان هەرێمەکەمان،هەرێمی کوردستانی عێراق و وڵاتانی دەووروبەرمان: تورکیا و ئێران و سووریا. بۆ نموونە چاککردن و باشکردنی ڕێگاوبانەکانی هەرێم لەگەڵ تورکیاو

سووریا، له ئاستی سیاسی دەكرێت پێشنیار بكرێت و پردێك دروستبكرێت لەسەر ئاوی فیشخابوور، كە هەرێمی كوردستان ببەستێتەوە بە كۆماری سووریا .

## 5 – 2 – پوختە و دەر ئە نجامەكان:

هەر لەگەڵ ڕوودانی سەرهەڵدانی پیرۆزی مانگی نەورۆزی ١٩٩١ ئاسۆیەكی تازەی دڵخۆشكەر بە ئایندەیەكی ڕووناك دەروازەی كرایەوە بۆ كوردستانی عیراق و گەلەكانی،هەر لە سەرەتاوە پارتەكان هەموو یەككەوتن و بە هەلبژاردنێكی دیموكراسی و یاسایی ، یەكەم حكومەتی نەتەوەی كوردییان دامەزراند ، و زۆر بە گورجی هێنایانە كایەوە لە ولاتەكەداو، هەروەها نەخشەشیان كێشا بۆ ئاوەدانكردنەوەی كوردستان.

گۆڕانكارییەكی زۆر ڕێك وپێكی بەردەوام هەر لەسەرەتاكانی سالی 1991 وە لەناوچەكەدا دەستی پێكرد لەبوارەكانی ئابووری و كۆمەلایەتی بە بەردەوامی گەشەی سەند، لەساڵی ١٩٩٦ (ح.هـ.ك) ی (پ.د. ك) هەروها هەموو پارتە ڕامیارییەكانی هەرێمەكە هاریكاری و هەماهەنگی باشیان تێكرا پێكەوە ئەنجام دا،سێیەم كابینەی وەزارەتیان دروست كرد بەسەرۆكایەتی بەرێز ( د. رۆژ نوری شاویس) .و بریاری/ ٩٨٦ و دەرئەنجامەكانیان وا گونجاند كە سوود و كەلكی بۆ ناوچەكە هەبێت و لەگەڵ ڕەوشی نێودەوڵەتیدا بگونجێت،لەبەر ئەوە گەشەسەندن و پێشكەوتنی زۆر بەخێرای بە بەردەوامی بە خۆوە بینی لە بوارەكانی كشتوكاڵ،پیشەسازی،ئاوەدانكردنەوە، خانووكردن بۆ هەموو چینەكانی میللەت، پەروەردە و ڕۆشنبیری،قوتابخانەكان بەسەرجەم قۆناغەكانەوە،نەخۆشخانە،ڕێگا وبان،كارەبا و پێداویستەكانی ئاو پاك كردنەوە( ئاوی خواردنەوە) ئاو ئاوەڕۆ،چاكسازی بواری ژیانی هەزاران كوردی دەركراو لەلایەن ڕژێمەوە،هەروها ئەوانەش، كە لەئێرانەوە گەڕانەوە بۆ كوردستان لەم ڕووەوە ئەوە زۆر گرنگە،كە نەتەوەی كورد بۆ یەكەم جار توانی حكومەتێكی یاسایی درێژخایەن دروست بكا و كاری هەرێمەكە بگرێتە بەردەست و گۆڕانكارییەكی مرۆڤایەتی ودیموكراسی و ئەزمونێكی پەسندو بەرێز بهێنێتە كایەوە،ئەوەش نەك لە كوردستانی عیراقدا بەڵكو لەهەموو پارچەكانی كوردستانی مەزن ئەمە یەكەم جاری بوو.

ئەو حكوومەتە زۆر بە پەرۆشەوە منداڵەكانی پەروەردەو ڕۆشنبیر كردووە و بە بیرو بۆچونی ئاشتی و ئاشتەوایی لەناو هەموو پارت و كەمایەتییە نەتەوەییەكان ، ڕەگەز و ئاینیەكان تێكرا بەگشتی ڕوە و بواری هەماهەنگی و هاوكاری گیانی برایەتی و پێكەوە ژیان و فرە حزبی و بەردەوامی

چاکسازییەکی باش لەهەموو بوارەکانی ژیاندا دەست پێ کردووە زۆر چالاکانە بەئەنجامییان گەیاند،کەهەموو بوارەکان لەلایەن حکوومەتی ناوەندییەوە وێران کرا بوون لە چەند ساڵێکی لەمەوپێش ,جگە لەپێکدادانی ناوخۆ، لەلایەك و لەگەل حکوومەتی ناوەندیش لەلایەکی ترەوە.

مەبەستی ئەم لێکۆلینەوەیە ئەوەیە : کەزانیارییە سەرەکییە گرنگەکان لەبارەی کوردستان و (ح.ھ.ك)و باری ئابووری‌و ئەرکی دەسەلاتی ئابووری بگاتە بەردەست،هەواڵێ تازەشمان بۆ بازرگان و کۆمپانیاکانی ولاّتە ئەوروپیەکانیش ئەوەیە،کە هەرێمی کوردستان ولاّتێکی رێك وپێك و ئاسایش و ئارامی بەتەواوی بالّی بەسەر ڕاکێشاوە ولاّتێکی دەولّەمەندەو کاروباری بازرگانی زۆر بەئاسانی تێیدا ئەنجام ئەدرێ وقازانجی باشیش لە بازرگانی کردن لەگەلیدا وەدەست دێت و هەلێکی زۆر باش و بەرفراوان ڕەخساوە،بۆ بازرگانیکردن لەگەلیدا،حکومەتی هەرێمی کوردستان هەموو دەم ئامادەیە ، بۆ هەموو هاریکاری و هەماهەنگییەك ، زۆر بەدلّنیانی ,ئەوەش گرنگە کە کۆمپانیا و بازرگانەکانی بیانی ئەوەش بزانن ، کە حکومەتی هەرێم نوێنەری لەهەموو وولاتانی ئەوروپی و رۆژ ئاوادا هەیە نوێنەرایەتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە ئەوڕوپا و هەروەها لەئەمەریکا ئامادەن هەموو زانیاریەك پێش کەش بە بازرگانیەکان و کۆمپانیا و ئەو هاوولاّتیانە بکەن ، کە پێویستییان پێ هەیە.

میللەتی کورد لە کوردستانی عیراق زۆر ڕوو خۆش و گەشبینن و زۆر حەز ئەکەن کە پەیوەندی بە بازرگانە بیانیەکان بکەن و لەگەلّیان کۆببنەوە و هاریکاری و هەماهەنگیان لەگەلّ بکەن و پەیوەندی بەردەوامیان لەگەلّ ببەستن زۆربەی پەیوەندییەکانیش لەسەربنەمای پەیوەندی کەسایەتی پێك دێت بەردەوام ئەبێت و لەسەر شێوەی برایەتی‌و خۆشەویستی بەڕێوە ئەچێت.

زۆربەی بەرهەمەکانی کوردستانی عیراق ئەنێردری بۆ تورکیا ، ئێران , عیراق و سوریا .ڕێککەوتن و پەیمانە بازرگانیەکانی کە لەنێوان بازرگانە بیانی و کوردەکان چەند زوو پێك بێت ئەوەندە زیاتر هەلی بازرگانی باش و مەزن ئەرەخسێنی بۆ بازاڕەکانی بازرگانی کوردستانی عیراق.

مەبەستێکی تری گشتی ئەم لێکۆلینەوەش ئەوەیە کەزانیاری و سەرە هێلّەکانی ڕێ پێشاندان بۆ بازرگانی کردن لّەگەلّ هەرێمی کوردستانی عیراق , پێش کەش بە کۆمپانیا و بازاڕەکانی ئەوروپا و رۆژئاوا بکات،تابتوانن کەرەسە و کەل وپەل و پێداویستیەکان بنێرن و بهێنن بۆ ئەم ولاّتە تازەیە بەپێی بەرژەوەندیەکانی ئێستاو ئایندەیان ، چونکە بازرگانیکردن لەگەلیاندا

ئاسانەو(ح.هـ.ك)هەموو ئاسانكارییەك پێشكەش بەهەموو ئەو كەسانە ئەكات كە بەرژەوەندییان هەیە بۆ بازرگانیكردن لەگەلیدا و ئەیانەوێ ووزە و تواناو سەرمایەكەیان با بەشێك لە سەرمایەكەیان لەو وڵاتە تازەدا بازرگانی پێ بكەن.

## هاوپێچەكان

**هاو پێچی زمار(٤(**

### ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان

### سزا نێو دەوڵەتییەكان بە پێی بڕیاری ژمارە ٦٨٨ لە ١٩٩١/٤/٥

**بڕیاری ١٩٩١/٦٨٨**

ئەم بڕیارە لە لایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی لە دانیشتنی ژمارە ٢٩٨٢ لە ١٩٩١/٤/٥ دەركرا.

**ئە نجومەنی ئاسایش.**

بۆ ئاگاداری ئەركەكانی ئەستۆمان و بەرپرسیارییەتیمان كەوا لە پەیمانی ڕێككەوتنی نەتەوە یەكگرتووەكان دەستنیشان كراوە لە پێناوی ئاشتیی نێو دەوڵەتی دەوڵەتەكان لەسەری پێكهاتوون.

بۆ پێداچوونەوەی بڕگەی(٧) لە بەندی(٢)ی پەیمانی نەتەوە یەكگرتووەكاندا، بە دلگیرییەوە بە هۆی بایەخ دان بەو فشارو كارەساتەی كە دانیشتوانی عیراق لە زۆر بەشەكانی ئەم ولاتەدا تووشی هاتوون،لەوانەش هەرە دوایان ناوچەی كوردستانی عیراق بووە، كە بووە بە هۆی كۆچ كردنی بەكۆمەلی زۆربەی میللەتی كوردو ڕۆیشتنیان بەرەو سنوورەكان بڕۆن و بەناچاری و یاساو ڕێساكانی سنووری نێو دەوڵەتی ببەزێنن كە ئەمەش لە ڕاستیدا ئەبێتە هۆی تێكدان و پێشێل

کردنی یاسا و ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی لە هەرێمەکەداو هەڕەشەی لێ دەکات کە سەرەنجام بوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی دانیشتوانێکی زۆری کورد لەسەر سنوورەکانی ئێران و تورکیا، و هەوڵ دانیان بۆ ئەوەی بچنە ئەم دەوڵەتانەوە بۆ پاراستنی ژیانی خۆیان و ولاتەکەیان بەجێ بڵێن،هەروەها بۆ بە پیرەوەچوونی داواکانی نوێنەرانی تورکیاو فەرەنسا کە بەرز کرابوونەوە بۆ رێکخراوی نێونەتەوەیی بە ژمارەی ٢٢٤٣٥ و٢٢٤٤٢ لە 2/4/1991 و ١٩٩١/٤/٤ (یەك لە دوای یەك). هەروەها بۆ بەدەنگەوەهاتنی داواکانی نوێنەری بەردەوامی کۆماری اسلامی ایران کە بەرز کرابوونەوە بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ژمارەکانی ٢٢٤٣٦ و ٢٢٤٣٧ لە بەرواری ٣-٤-١٩٩١ لەو راپۆرتانەشدا جەختییان لەسەر پاراستن و ڕێزی سەروەری دەوڵەتە ئەندامەکانی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی کرد بۆوە هەروەها پاراستنی سنووری دەوڵەتانی ناوچەکە بە تایبەتی عیراق.

ئەبێ راپۆرتی سکرتێری گشتی نێونەتەوەیی ژمارە ٢٢٣٦٦ لە 20/3/1991 مان لەیاد نەچێت،کە ئەمەو ئەمانەی سەرەوە گشتی بووە هۆی دەرچوونی ئەم بڕیارانەی خوارەوە-:

-1ئێمە گوشار خستنەسەر دانیشتوانی شارستانی لە هەموو بەشەکانی عیراق لەوانەش ناوچە کوردنشینەکان بە تاوان دائەنێین لەبەر ئەوەی ئەو گوشارانە بوونە هۆی هەڕەشە لەسەر ئاشتی و ئاسایشی جیهانی و نائارامی لە ناوچەکەدا.

-2داوا ئەکەین کە عیراق هاوبەشی تەواو بکات لە لابردنی هەموو هەڕەشەیەك لە ڕووی ئاشتی جیهانی و ئاسایشی ناوچەکە و زۆر بە پەلە کۆتایی بە بواری نائاسایی ناوچەکە بهێنێت و ئاوات و خواستی باش دەربېرێ لەسەر هەموو کێشەکانی کەوا لیژنەی بڕیاری ١٩٩٠/٦٦١ ڕەزامەندی لەسەر دەر ئەبڕێ بەشێوەیەکی نائاسایی ئەو خەرجییانەی کە لەسەر حیسابی(رصیدی) بڕی پارەی داهاتی نەوتی ئایندەی بە چەك ڕائەکێشرێ لەو بڕە پارەی کە لە بانکدا دائەنرێ.

-3جەخت لەسەر ئەو بابەتە ئەکرێتەوە کە عیراق پێویستە زۆر بە پەلە ڕێگا بدات بە ڕیکخراوە خێرخوازە نێو دەوڵەتییەکان کە یارمەتییەکانییان بگەیەننە هەموو ئەو هاوولاتییانەی کە پێویستیان بە یارمەتی هەیە لە هەموو بەشێکی ولاتدا و هەروەها پێویستیشە هەموو ئاسانکارییەك بۆ ئەم مەبەستە دابین بکات.

4-داوا له سکرتێری گشتی نێونەتەوەیی ئەکرێ کە بەدوای هەموو هەوڵ و ئەرکە مرۆڤایەتییەکانی خۆیدا بچێت لە عیراقدا،بەپەلەو زوو ڕاپۆرت بدات لەبارەی چۆنیەتی و ڕێك و پێکی بەڕێوەچوونی ئەرکەکان،دابین کردن و بەجێهێنانی ئەرکەکانی هاووڵاتییانی شارستانی عیراق،بەتایبەتی دانیشتوانی کورد،کە ئەگەر هیچ گازندە و ئازارێکیان هەبێت بەهۆی دەسدرێژی دەسەلاتدارانی عیراق بۆ سەر مافەکانییان.

5-داوا لە سکرتێری گشتی ئەکەین،کە زیاتر هەوڵ بدات سوود وەرگرێ لە هەموو ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستیدایە بەهەموو ئاژانس و ڕێکخراوە خێرخوازەکانی هەمەجۆری( UN)ەوە لەپێناو ئاگادار کردنەوەی بەپەلەی هەموو پێداویستییە گرنگەکانی هاووڵاتییانی پەناهەندە و دەرکراوەکان .

6-بانگەوازێك بکات بۆ هەموو دەوڵەتە ئەندامەکانی ( UN) و گشت ڕێکخراوە مرۆییە خێرخوازەکان بۆ هاوبەشیکردن لە پێناو ئەنجامدانی پرۆژەی فریاگوزاری.

7-داوا لە حکوومەتی عیراق ئەکەین کەوا هاوکاری تەواوی سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان بکات تا کۆتایی.

8-بڕیار درا ئەم کێشەیە جێبەجێ بکرێت.

## نەتەوە یەکگرتووەکان

## بڕیاری‌نێو دەوڵەتی ژمارە (٩٨٦(UNSCR-986) )

## لەسەر ١٩٩٥/٤/١٤/ 1995

### ئەنجوومەنی ئاسایش

ئەنجومەنی ئاسایش چاو بە سەرجەم بڕیارەکانی پێشوویدا ئەخشێنێتەوە،کەوا پابەندن بە ژیان و خواردەمەنی‌و پێداویستییە مرۆڤایەتییەکان و تەندروستی خەڵکانی عیراق بۆ پاراستنیان لەو هەڕەشانەی کەوا هاولاَتیانی عیراق ئەتۆقێنێ .
لەسەر پلە و پێوەری پێداویستییە هەنووکەییەکان و مرۆییەکانی هاولاَتیان تاکو عیراق سەرجەم بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش کە پەیوەندییان بەو بابەتە هەیە بە تەواوی جێ بەجێیان ئەکات، لەوانەش بە شێوەیەکی بەرچاو ڕەچاوی جێ بەجێ کردنی بڕیاری ٦٨٧ ی ساڵی ١٩٩١ کە لە ١٩٩١/٤/٣ دەرچووە ئەبێت بە تەواوی جێ بەجێ بکرێت، ئەو بڕیارەش دەسەلاَت دەداتە ئەنجومەنی ئاسایشی نێونەتەوەیی کەوا دەست بەکاربێت بەو دەسەلاَتانەی کەوا سەرجەم توانای بڕیاردانی پێویستی ئەداتێ بۆ جێ بەجێ کردنی بڕیاری ژمارە (٦٦١)ی سالی ١٩٩٠ ی بەرواری ١٩٩٠/٨/٦ بۆ لابردنی سزاکان بە پێی فەرمانی هەموو بڕیارەکانی پێشوو.پێویستە عیراق زۆر بە ڕەزامەندییەوە سەرجەم پێداویستییە مرۆڤاییەتی و فریاگوزارییە گشتییەکانی هاولاتییانی سەرتاپای عیراق بە شێوەیەکی یەکسانی دابەش بکات.

جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کەوا هەموو ئەو حکومەتانەی ئەندامن لە ڕێکخراوی نێو نەتەوەیی ئەبێ بەچاوی ڕێزەوە تەماشای سەروەری عیراق بکەن و ڕێزی سنوورەکەی بگرن.

بەپێی فەرمانی بەشی ( VII) لە ڕێکەوتننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان ئەبێ ئەم خالاَنەی خوارەوە جێبەجێ بکرێن-:

١. هەموو دەولَەتەکان بێ گەرانەوە بۆ فەرمانەکانی برگەی (٣أ،٣ب و ٤)لە بڕیاری/١٩٩٠/٦٦١ و گشت ئەو بڕیارانەی کە پەیوەندییان پێوە هەیە،دەسەلاَتییان پێ ئەدرێ کەوا بتوانن نەوت وبەرهەمەکانی نەوتی عیراقی بکڕن و کۆگای بکەن و هەموو کاروبارێکی دارایی جێ

بەجێ بکەن کە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە بە شێوەیەك کە عیراق بتوانێ کۆی نرخی یەك بلیۆن دۆلاری ئەمەریکی تێنەپەڕێ نەوت و بەرهەمەکانی نەوت بەرهەم بهێنێ لە ماوەی هەموو(٩٠)ڕۆژێکدا بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکانی ئەم بڕیارە،بۆ دابین کردنی فریاگوزاری مرۆڤایەتی بۆ هەموو دانیشتوانی عیراق.ئەمەش بە ئەنجامدانی ئەم کارانەی خوارەوە -:

أ–ڕەزامەندی ئەو لیژنەیەی دامەزراوە بە پێی بڕیاری/٦٦١/١٩٩٠ پێش وەخت وەربگیرێ لەسەر هەموو کردارو چالاکییەکان بۆ دەستنیشان کردنی هەمووو ڕەوشەکانی کڕین و فرۆشتن بە شێوەیەکی ئاشکرا و ڕوون،کە دوایی پێشکەش کردنی داوای کڕین لەلایەن حکومەتی پەیوەندیدار و حکوومەتی عیراقیش چەکی بۆ واژە ئەکا و کڕیارەکە هاوپێچی داواکەی خۆی ئەکا بۆ هەموو کڕینێکی نەوت و بەرهەمەکانی نەوتی عیراقی. ئەو داوایەش ئەبێت نرخی بازاری نەوت بەباشی،ڕێگای هەناردنە دەرەوەی بەرهەمەکە،کردنەوەی حیسابی ئیعتیماد کە بتوانرێ کۆی پارەکە بخرێتە سەر حسابی بانك بەناوی سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نێو نەتەوەیی کە دامەزراوە بۆ مەبەستی جێ بەجێ کردنی ئەم بڕیارەو هەموو کارو بارو چالاکییەکی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بواری داراییەوە،یاخود کار و باری بنەڕەتییەوە هەیە،ئەم کردارانەش لە هەموو کردەوەیەکی کڕیندا دووبارە ئەبێتەوە .

ب– تەواوی بڕی پارەی کڕینی نەوت و بەرهەمی نەوتی عێراقی هەموو جارێك ڕاستەوخۆ لە لایەن کڕیارەوە بە چەك ئەخرێتە سەر حیسابی ئیعتمادی بانگ لە وڵاتەکەی خۆی سکرتێری گشتی UN حسابێك بۆ مەبەستی جێ بەجێ کردنی ئەم بڕیارە ئەکاتەوە .

٢. تورکیا دەسەڵاتی ئەدرێتێ بێ گەڕانەوە بۆ فەرمانەکانی بڕگەی (٣ أ)، (٣ ب) و 4 ی بڕیاری ٦٦١ – ١٩٩٠ کە لە سەروە باس کران ڕێگای هەناردنە دەرەوەی نەوت و بەرهەمەکانی نەوتی عێراقی بە پێی پێویست بدات ئەوەش پاش داشکاندی ئەو ڕێژەی لە سەدای کەوا ئاماژی پێکراوە لە بڕگەی (٨ ( c , ی لە خوارەوە کە بۆ مەبەستی قەرەبوو کردن، بۆ خەرجی ڕۆیشتنی نەوت و بەرهەمەکانی نەوت بە ناو بۆرییەکاندا و ئەوەش پاش ئەوەی ئەو کارانە لە لایەن ئاژانسە سەربەخۆکانی پشکنین کە لە بڕگەی (٦ ) ی خوارەوە باس کراوە چاوی پێدا ئەخشێنرێتەوە پەسەند ئەکرێت و ئەنجام ئەدرێت ئەم دەسەڵاتەش هەموو کارو باری گواستنەوەی نەوت و بەرهەمەکانی نەوتی عیراقی ئەگرێتەوە کە لە ڕێگای

بۆرییەنەوتیەکانی (کەرکوك ، یامورتالیك) ی نێو تورکیا ئەگرێتەوە کە بە پـێی برگـەی (١) ی سەرەوەی ئەم بڕیارە دەسەلاتی پیٚ دراوە .

٣. بڕیار درا کە برگەی (٢,١ ) ی ئەم بڕیارە بە پێوەری کاتی ڕۆژهەلات لـە کـات ژمێـری (١) ی پاش ڕۆژی دوایـی ئاگـادار کردنـەوەی ئەنـدامانی ئەنجومـەنی ئاسـایش لـە لایـەن سـەرۆکی ئەنجومەن بە گەیشتنی ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی UN کە لە برگـەی (١٣) ی خـوارەوە دا هاتووە پیادە بکرێت ئەم بڕیارەش بـە بـەردەوامی پیـادە ئـەکرێت بـۆ مـاوەی (١٨٠) ڕۆژ , ئەگەر ئەنجومەن بڕیارێکی تر دەرنەکا بە پێی فەرمانی بڕیاری ٦٦١ — ١٩٩٠ .

٤. بڕیار درا کە هەموو کار و بارەکانی کە بە پێی برگەی (١) ی ئەم بڕیارە جـیٚ بـەجیٚ ئـەکرێن لە ماوەی (٩٠) ڕۆژی دوای پیادە کردنی دا چاوی پێدا بخشێنرێتەوە هەروەها لە دوای (١٨٠ ) ڕۆژی سەرەتای پیـادەکردنی، ئـەبیٚ سـەرجەم ڕاپۆرتـەکانی کـە لـە برگـەی (١١ ، ١٢) ی خوارەوە داوا کراون ، بگەن بە جێگای پەیوەندیـدار، لـەو ڕاپۆرتانەشـدا ئـەبێت بـە ئاشـکرا خواست و سەرنجەکانی لە بارەی تازە کردنەوەی فەرمانـەکانی ئـەم بڕیـارە دیـاری بکـرێن، ئاماژەش بەوە بکەن کە ڕاپۆرتەکانی بـەرز کرانـەوە بـە پێـی برگـەی (١٢,١١) ی بـە تـەوای دەست نیشانی ئەو خالانە ئەکەن کە هەموو فەرمانـەکانی ئـەم بڕیـارە بـە تـەواوی و ڕێـك و پێکی جیٚ بە جیٚ کراون .

٥. ئەبیٚ هەموو برگەکانی تری ئەم بریارە یەکسەر پیادە بکرێن .

٦. ئەبیٚ ئەو لیژنەیەی کە دامەزراوە بە پێی بڕیاری (٦٦١ — ١٩٩٠ ) سەرپەرشـتی و چـاودێری بەڕێوەبردنی کار و باری فرۆشتنی نەوت و بەرهەمەکانی نەوتی عیراق بـۆ هەناردنـە دەرەوە لە ڕێگـای تورکیـاوە بـە بۆرییـەکانی کـەرکوك — یامورتالیـك لـە عیراقـەوە بـۆ تورکیـا و لـە بەندەری سەرەکی عیراقی البکر ئـەنجام بـدات، لەگـەلّ یارمـەتی ئاژانسـە سـەربەخۆیەکانی پشکنین کە لەلایەن سکرتێری گشتییەوە دائەمەزرێن، ئەوانەش ئاگاداری لیژنەکە ئەکەنەوە بە هەموو زانیاری بڕی ئەو نەوتەو بەرهەمەکانی کە ئەنێردرێتە دەرەوە بە پێی برگەی ( ١ ) ئەم بڕیارە، هـەروەها نرخـی نـەوت و لەگـەلّ نرخـی بـازاری جیهـانی بـەراورد ئـەکا و پێیـدا ئەچـێتەوە ئـەوەش بـۆ ڕێکخسـتنی کـار و بارەکـانی ئـەم بڕیـارە. زۆربـەی بـڕی نـەوت و بەرهەمەکانی بە ڕێگای بۆرییەکانی نەوتی کەرکوك — یامورتالیك ئەنێردرێتە دەرەوە ئەوەی تریشی لە ڕێگای بەندەری البکری عیراقی ئەنێردرێتە دەرەوە .

٧. داوا لە سکرتێری نەتەوە یەکگرتوەکان ئەکرێت کە حسابی ئیعتماد دابمەزرێنێ بۆ جێ بەجێ کردنی مەبەستەکانی ئەم بڕیارە ، زمێریای گشتی خاوەن بروانامە دابمەزرێنێ بۆ پێداچوونەوەی کار و بارەکان و بە تەواوی حکومەتی عیراقیش ئاگادار بکاتەوە بە هەموو زانیارییەکی پێویست .

٨. بڕیار دارا کە داوا لە سکرتێری گشتی بکرێت بری پارەی حسابی ئیعتماد بۆ خەرجی کارە مرۆییەکانی هاولاتییانی عیراق بەکار بهێنێ و لە خەرج کردنیدا ڕەچاوی ئەم خالانەی خوارەوە بکات :

أ) خەرجی هەموو ئەو کەل و پەل و کەرەسانەی کە ئەنێردرێنە عیراق ئەنجام بدرێت بە پێی ڕێگا و ئامۆژگاری و مەرجەکانی ئەو لیژنەیەی بە بڕیاری ( 1990 – 661 ) دامەزراوە، بە تایبەتی کار و باری هێنانی داو دەرمان و پێداویستییەکانی تەندروستی، کەرەسەی خواردەمەنی. کەل و پەلەکانی کە پێویستن بۆ پێداویستییەکانی هاولاتییان هەروەك ئاماژەی پێ نەکراوە لە بەشی ٢٠ بڕیاری ژمارە 687/1991 کەوا ئەلێ -:

١. هەموو ئەو کەل و پەلانەی ئەهێنرێتە عێراقەوە ئەبێ بە پێی داواکانی حکومەتی عێراق بن .

٢. عێراق بە تەواوی دەستە بەرەی ئەوە ئەکات کەوا هەموو ئەو کەل و پەلانەی کە ئەهێنرێتە عێراقەوە بە یەکسانی دابەش ئەکرێن لەسەر بنەماکانی نەخشەیەکی دارێژراو بە ڕەزامەندی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەوەش ئەگرێتەوە کە ئەبێت لیستی ڕوونکردنەوەی ئەو کەل و پەل و خواردەمەنییانەی کڕاون هاوپێچ بێت لەگەڵ هەموو ڕەزامەندییەکانی سکرتێری گشتی .

٣. سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە تەواوی لەوە ئاگادار ئەکرێنەوە کەوا هەموو ئەو کەل و پەل و پێداویستییانەی کڕاون و نێردراون بۆ عیراق تێکڕا گەیشتوونەتە عیراق .

ب// بۆ جێ بەجێ کردنی تەواوی، پشکنین و پێداچوونەوەی لە کاتی بارو دۆخی نا ئاساییدا بە باشی ئەزانین لەو سێ پارێزگایانەی کە لە خوارەوە باسیان ئەکەین، دابەشکردنی کەل و پەل و کەرەسە و پێداویستییەکان لە لایەن حکومەتی عیراقەوە بێ. بۆ هەموو ئەو کەل و پەلانەی کەوا بە پێی ئەم بڕیارە کەوا ئەهێنرێن و وئەکرێن ، ئەوەش بۆ مەبەستی ئەوەی کە ئەو پێداویستیە مرۆیانەی دانیشتوانی عیراق ئەکرێن ئەهێنرێن بە شێوەیەکی یەکسانی لە هەموو ناوچەکانی عێراقدا

دابەش بکرێن.بڕی پارەی ١٣٠–١٥٠ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی هەموو(٩٠) رۆژێك بۆ مەبەستی جێ بەجێ کردنی کارو باری بەرنامەی مرۆڤایەتی ئاژانسەکان و رێکخراوەکانی UN لە سنووری سێ پارێزگای باکووری عیراق ئەوانیش (دهۆك هەولێر سلیمانی)بە مەرجێ-:

أ–سنووری سەروەری عیراق رێزی لێ بگیرێ،ئەگەر ئەو برەپارەش ئامازەی بۆ کراوە لە یەك بلیۆن دۆلاری ئەمریکی کەمتر نەبێت لە هەموو(٩٠ (رۆژێکدا،کە ئەگەر پوختەی بڕی پارەی نەوت و بەرهەمی نەوتی فرۆشراو لەوە کەمتر بوو لە مامەی(٩٠) رۆژەدا ئەوساکە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆی هەیە رێژەیەکی کەمتر لەو برەی لەسەرەوە دیاریکراوە تەرخان بکات بۆ ئەو مەبەستە.

ب–دانەوەی قەرەبوکردنی زیانی قوربانییان بەپێی رێژەی(٪) بڕی پارەی حیسابی (رصید)ی نەوتی فرۆشراو لە بانکدا بەو رێژەیەی کە ئەنجوومەنی ناوبراو بریاریداوە لە بڕگەی ٢ی بڕیاری ٧٠٥ –١٩٩١ کە لە ١٩٩١/٨/١٥ دەریکردووە جێ بەجێ ئەکرێت.

ج–بۆ ئەوەی کرێ و خەرجی رێکخراوو ئاژانسە سەربەخۆکان و فەرمانبەرانی UN بۆ ئەنجامدانی کارەکانی پشکنین و هاتوچۆ و هەموو چالاکییەکانی،کە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەبێت دابین بکرێت،ئەم کارە بەپێی جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارە دیاری ئەکرێت.

د–خەرجی ئەو کارو چالاکییە تایبەتییانەی ئێستا UN ئەنجامییان ئەدات بە پێی ئەو دەسەڵاتەی پێی بەخشراوە لە بڕگەی ( C ) ی بڕیاری ٦٨٧ ی سالی ١٩٩١ بەتەواوی دابین ئەکرێت.جگە لەو خەرجییە شیاوانەی کە لە عیراقدا ئەدرێت.خەرجییەکانی کاروباری هەناردنە دەرەوە،کەوا لە لایەن ئەو لیژنەیەی بەپێی بڕیاری ٦٦١–١٩٩٠ دامەزراوە بڕیار ئەدرێت ئەو چالاکییانە بە شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندی هەبێت بە ناردنە دەرەوەی نەوت و بەرهەمەکانی نەوتی عیراقی گشتی ئەگرێتە خۆی،کە بە پێی بڕگەی(١)ی ئەو بڕیارەی لەسەرەوە باسکراوە،جێ بەجێ ئەکرێت،بەمەرجێ مۆڵەتی هەناردنە دەرەوەی پێش وەختی پێ وەرگیرابێ یا پەیوەندی راستەوخۆی هەبێت بە کارو باری هەناردنە دەرەوەی نەوت و بەرهەمەکانی نەوتی عیراقی و چالاکییەکانی،یاخود پەیوەندی راستەوخۆی هەبێت بە پارچەو ئامێرەکانی(کاروباری نەوت) و مۆڵەتی پێ درابێت بە پێی بڕگەی(9) ی کە لە خوارەوە باسکراوە.

هـ- ئەتوانرێ هەموو(٩٠)رۆژێك بە بڕی ١٠ دە ملیۆن دۆلاری ئەمریكی لە بڕی ئەو پارەیەی كە لە حیسابی بانكدایە خەرج بكرێت بۆ ئەو خەرجییانەی كە بڕگەی (٦) لە بڕیاری ٧٧٨ -١٩٩٢ ی بەرواری ١٩٩٢/١٠/٢ ئەیانگرێتەوە.

١. دەوڵەتەكان دەسەلاتییان پێ بدرێ بێ گەڕانەوە بۆ فەرمانەكانی بڕگەی (C 3) لە بڕیاری 661-1990بەم شێوەیەی خوارەوە -:

I. ئەتوانن هەموو پارچەو ئامێرێك كە پێویست بێت بۆ پاراستنی سیستەمی بۆڕی نەوتەكانی كەركوك - یامورتالیك بنێرن بۆ عیراق بە مەرجێك،كە پێش وەخت ڕەزامەندی ئەو لیژنەیە وەربگیرێت كە بە پێی بڕیاری ٦٦١-١٩٩٠ دامەزراوە بۆ هەموو گرێ بەستەكانی هەناردنە دەرەوە .

II. بۆ پیادە كردنی هەموو چالاكییەكانی كە ڕاستەوخۆ پێویستە بۆ هەناردنە دەرەوەی كە ڕێگای پێدراوە بە پێی بڕگەی لاوەكی ژمارە (أ) كە لە سەروە ئامارەی پێكراوە لەوانەش هەموو كاروباری كڕین و فرۆشتن و دارایی،كە پەیوەندی بەو كارانەوە هەیە هەموویان ئەگرێتە خۆی .

١. لەبەر ئەوەی هەموو خەرجییەكانی هەناردنە دەرەوەو گشت چالاكییەكانی،كە ڕێگای خەرج كردنی پێدراوە بەپێی بڕگەی(٩)ی كە لە سەرەوە باسكراوەنییە بەلام بەپێی بڕگەی(٤)ی بڕیاری ٦٦١-١٩٩٠ و بڕگەی (١١)ی بڕیاری ٧٧٨-١٩٩١ ئەو ڕێگایەی لێ داخراوە كە لە پارە دەست بەسەر داگیراوەكانی عیراق(النقود المجمده او المصادره)خەرج بكرێت،لەبەر ئەوە بڕیار درا كە هەموو خەرجی و چالاكییە پێویستییەكانی كارو باری نەوت هەناردنە دەرەوە لە حسابی فرۆشتنی ئایندەیی نەوتی عیراق چارەسەر بكرێت بە شێوەیەكی نائاسایی تاكو پارە لە حیسابی ئیعتیمادی نەوت فرۆشتنی عیراق كۆ ئەبێتەوە بە شێوەی كرداری. حیسابی ئیعتیمادی ناوبراو بە تایبەتی بۆ ئەنجامدانی مەبەستەكانی ئەو بڕیارە دائەمەزرێتنئەوەش پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەو لیژنەیەی كە بە پێی بڕیاری ٦٦١-١٩٩٠ دامەزراوە.بە شێوەیەكی نائاسایی بە نامەی ئیعتیماد رائەكێشرێ لە حسابی ئیعتیمادی بڕی پارەی فرۆشتنی ئایندەیی نەوتی عیراق هەمووشی لەو حسابەدا كۆ ئەبێتەوە(تا لە ئایندە چارەسەر ئەكرێت .(

٢. داوا ئەکەین کەوا سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕاپۆرت بداتە ئەنجوومەنی ئاسایش لە دوای(٩٠) ڕۆژ لە پیادە کردنی بڕگەی (١)ی سەرەوە هەروەها دووبارە پێش ئەوەی (١٨٠) ڕۆژی یەکەم کۆتایی بێت،لەسەر بنچینەی سەرنجەکانی دەستەی کارگێری فەرمانبەرانی نێونەتەوەیی لە عیراقدا و بنەمای ڕاوێژکاریان لەگەڵ حکومەتی عیراق لەبارەی،ئایا حکوومەتی عیراق بە شێوەیەکی یەکسان دەرمان و پێداویستییەکانی تەندروستی و خواردەمەنی بەسەر هاوولاّتییاندا دابەش کردووە،هەروەها حکوومەتی ناوبراو هەموو پێداویستییە سەرەکییەکانی کە بە پارەی داهاتی بڕگەی زمارە(٨أ) ی سەرەوە کڕاون گەیاندووەتە هاوولاّتیان و ئایا ڕاپۆرتەکەی هیچ سەرنجێکی تێدایە لەبارەی داهاتی نەوتی عیراق و پلەی توانای عیراق بۆ هەناردنە دەرەوەی نەوت و بەرهەمەکانی نەوت(بەپێی بڕگەی (١)ی کە لەسەرەوە باسکراوە) بۆ فریاکەوتنی زیاتری پێداویستییە مرۆییەکانی دانیشتوانی .

٣. داوادەکرێ لەو لیژنەیەی بەپێی بڕیاری بڕیاری ٦٦١–١٩٩٠ دامەزراوە کە هاریکاری و ڕێکخستنێکی پتەو(بە پەلە) لەگەڵ سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕێك بخات لەپێناو گەشەسەندنی ڕێبازە پێویستەکان بۆ بەئەنجام گەیاندن و ڕێك و پێکخستنی مەبەستی بڕگەکانی(١٠،٩،٨،٦،٢،١)ی بڕیارەکەو ڕاپۆرتێك پێشکەش بکات لە دوای(٩٠)ڕۆژ بەسەر تێپەڕبوونی پیادەکردنی بڕگە(أ)ی ئەم بڕیارە کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکراوە،هەروەها ڕاپۆرتێکی تر پێش تەواوبوونی ماوەی ئەو (١٨٠)ڕۆژەی کە بڕیارەکە کاری پێ دەکرێ ئەوە دەستنیشان بکات کەوا گفتوگۆیەکی سەربەست و ئازاد لەئارادایە بۆ دابین کردن و پاراستنی هەموو مافە مرۆیی و ڕامیارییەکانی هاوولاّتیانی عیراق .

13-داوا لە سکرتێری گشتی دەکریت سەرجەم ئەم کارانە ئەنجام بدات کە پێویستن بۆ دابین کردنی میکانزمێکی (ڕێبان)ێکی چالاك و توند و تۆڵ بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم بڕیارە، دەسەلاّتی ئەوەشی پێ دراوە کە سەرجەم کاروبارەکان ڕێك بخات و هەموو کردارێك بخاتە کار کە بە پێویستی دەزانێ لەم پێناوەدا. هەروەها ڕێکەوتنامەو پەیمان ئەنجام بدات و لە هەر کاتێکدا بە پێویستی زانی، دەتوانێت ڕاپۆرت بەرز بکاتەوە بۆ ئەنجومەنی ئاسایش بۆ دەربڕینی بیر و بۆچوونەکانی خۆیو ئەو کارانەی ئەنجامی داون لەم بارەیەوە، ئەوە جگە لەم ڕاپۆرتانەی کە لەمەو پێش ئاماژەمان پێ کردبوون .

14- ئەبێت نەوت و بەرهەمەکانی کە بە پیّی ئەم بڕیارە بەرهەم دێن لە عیراقدا بە ناوی نەوتی عراقییەوە بە شێوەیەکی یاسایی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.چ لە هەناردن و چ لە کڕین و فرۆشتندا، بە هیچ شێوەیەك رێگە نادرێت مامەڵەی نایاسایی لەگەڵ بکرێت. زۆریش پێویستە کە هەموو دەوڵەتەکان لە گشت بوارێکدا و هەموو هەنگاوێك و هەڵوێستی یاسایی پێویست بگرنە بەر،بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە بەپێی ڕێزگرتن لە یاساو ڕێساکانی ناوخۆیان بۆ ئەوەی هەموو پارێزگارییەك دابین بکەن لە داهاتی فرۆشتنی بەرهەمەکان و بەهیچ شێوەیەك مامەڵەیەکی لەگەڵدا نەکرێت کە پەیوەندی نەبێت بە مەبەست و ئامانجەکانی کەوا دەستنیشان کراوە لەم بڕیارەدا.

15-جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کەوا حیسابی ئەو ئیعتیمادەی دامەزراوە بۆ جێ بەجێ کردنی ئامانجەکانی ئەم بڕیارە هەموو سوود و کەڵك و پاداشتێکی یاسای نەتەوەیەکگرتووەکان ئەیگرێتەوە.

16-جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە سەرجەم ئەو کەسانەی سکرتێری گشتی دایاندەمەزرێنێ بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری پیادەکردنی بڕگەکانی ئەم بڕیارە ئەوانە سەرجەم هەموو پاداشت و سوودو کەلکێك کە ئەدرێت بە شارەزایانی نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکان یەکسان ئەدرێت بەوانیش،ئەوەش بەپێی هەموو گرێبەندو رێککەوتنێکی نەتەوەیەکگرتووەکان کە پەیوەندییان هەیە بە پاداشت و سوودی فەرمانبەران و هاوکارانی نەتەوەیەکگرتووەکان،جا لەبەر ئەوە پێویستە حکومەتی عیراق ئازادیی تەواو بدات بەم فەرمانبەرانە بۆ ئەنجامدانی هەموو جموجۆڵ و چالاکییەك کە پێویستن بۆ ئاسانکاری و ئەنجامدانی ئەرکەکانی خراوەتە ئەستۆیان لەپێناوی جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارەدا.

17-جەخت دەکەینەوە لەسەر ئەوەی کە هەرگیز و بە هیچ شێوەیەك ئەنجامدانی ئەم بڕیارە کار ناکاتە سەر ئەرکەکانی حکوومەتی عیراقی کەوا پاشەکشە بکات لە بەدیهێنانی دانەوەی هەموو قەرزو قۆڵەو هەستان بە ئەرکەیاساییە نێونەتەوەییەکان بە شێوەیەکی تەواو و رێك و پێك بەپێی یاساورێسا نێونەتەوەییەکان.

18-جەخت دەکەینەوە کە هیچ شتێك لەم بڕیارەدا بەهیچ شێوەیەك نابێتە هۆی گیروگرفت و ئاستەنگ بۆ سەروەریی عیراق،و ڕێزگرتن لە سنوورەکەی.

19- ئەم بڕیارە پێویستە جێبەجێ بکرێت و بە هەند وەربگیرێت.

سەرچاوەو پەراوێزەکان:

ئەو سەرچاوانەی /کە بە زمانی ئینگلیزی چاپکراون-:


سیامند بەنا , ساڵی ۲۰۰۱، ناوچە پارێزراوەکە . بەریتانیا .چالیات جیرارد ،۱۹۷۸، گەلی بێ نیشتمان،زیدZED) لەندەن – بەریتانیا (

غەریب ، ئەدمۆند ،۱۹۸۱ ، کێشەی کورد لەعیراقدا . سیداکۆس پرێس و نیویۆرای – ئەمریکا.

دکتور قاسملۆ عبدالرحمن ،۱۹٦٥، کوردو کوردستان / کۆلێتس – لەندەن – بەریتانیا.

ئیزادی میهرداد /۱۹۹۲ – رەگ و ڕەسەنایەتیی کوردەکان/ تابلۆر – واشنتۆن – ئەمەریکا.

کرینبرۆك فلیپ ج – ۱۹۹۲ / پێداچونەوەیەکی گشتی کورد/ رۆتلێخ – بەریتانیا.

ماکدونالد دەیڤید/۱۹۹۲ / کورد ئەو گەلەی هەوڵی سڕانەوەی دراوە – MRG, لەندەن – بەریتانیا.

دکتور – شفیق قەزاز – ۲۰۰۱ / پێشبینی بۆ هاوچەشنی سەدام حسین لەعیراقدا – لە دێمانەیەکی رۆژنامەنووسیدا – واشنتۆن – ئەمریکا.

پرۆفیسۆر – ئۆلێری کارۆڵ /۲۰۰۱/بۆ ولاتی دژەفڕین – بەڵێ کوردستان هەرێمی دیموکراسی – ڕۆژنامەی واشنتۆن بۆست/ بەرواری / ۲۰۰۱/۷/۱٥ /واشنتۆن/ ئەمریکا.

سارالینین مەتی – /۱۹۹٦ – کوردستان – فنلەندە/ وەزارەتی دەرەوەی فنلەندە – 4V1 هێلسنکی.

یاسین ، برهان الدین – 1955 – A – خەیاڵ ، پاراستی زانکۆیLUN) چاپخانەی زانکۆ – لۆند (Lund)).

(GBSR)مەکتەبی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوە) ساڵی /۱۹۹۸ / لە پەرتوکی/ کورتە باسێکی ئابووری ودارایی / جیۆگرافی ومێژوویی کوردستان هەولێر – کوردستانی عیراق.(

بابەتەکانی کۆنفرانسی (پ. د . ك) لە ١٧–١٨/٤/٢٠٠٠

لێکۆڵینەوەی پێناسەی کورد – نیویۆرك.

کوردستان نیوز / رۆژنامەیەکی مانگانەیە / کوردستان.

کوردستان تودەی / ( ح . هـ . ك ) ستۆکهۆلم – سوید.

..............................................

-

-

<u>ئەو سەرچاوانەی بەزمانی کوردی چاپکراون</u>

-سەرچاوەکان ( کتێب و گۆڤارەکان ) بە زمانی کوردی:

-1جەزا تۆفیق تالیب، ١٩٩٩، بایەخی جیۆپۆلیتیکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عیراق، سولەیمانی، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، کوردستان.

-2دکتۆر عەبدوڵا غەفوور، ٢٠٠٠، جوگرافیای کوردستان،دەزگای موکریان، هەولێر، کوردستان.

=3دەزگای سەنتەری برایەتی،١٩٩٩،جیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عیراق،هەولێر،کوردستان.

-4ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عیراق، ٢٠٠١ ,ئاوەدانکردنەوەی کوردستان لە ساڵێکدا، چالاکییەکانی کابینەی چوارەم لە ساڵی ٢٠٠٠ داو پلانەکانی بۆ داهاتوو، دەزگای ئاراس، هەولێر،کوردستان.

-5مەکتەبی ناوەندی دیراسات و تۆژینەوەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق، ١٩٩٧، نەوتی کوردستانی عیراق، بەشی یەکەم و دووهەم، ژمارە ٣١ وە ,32 هەولێر ،کوردستان.

-6گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ، ١٩٩٩، ژمارە ١ وە , 2 سولەیمانی ، کوردستان.

-سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:

رسالة الماجستير: كولدران عبدالرحيم ، ١٩٩٩، واقع النشاط التجارى فى اقليم كوردستان– العراق، جامعة صلاح الدين، كلية الادارة والاقتصاد، اربيل ,كوردستان.

رسالة ماجستير: نوزاد محمد حسن، ١٩٩٢، واقع و افاق التنمية الصناعية فى منطقة كردستان للحكم الذاتى، جامعة صلاح لدين ،اربيل ,كوردستان.

سەنتەری برایەتی – پەرتوکی ژمارە /٣/جیوگرافی هەرێمی کوردستانی عیراق/ هەولێر/کوردستان/١٩٩٩.

غەفور عبدالله – جیۆگرافی کوردستان – دەزگای موکریانی

)ح . ھ . ك ) هەولێر – کوردستان /٢٠٠٠.

ئاودانکردنەوەی کوردستان / چالاکییەکان و نەخشەوپلانەکانی ئایندەی کوردستان لەلایەن (ح.ھ.ك) سەنتەری رۆشنبیری ئاراس ، هەولێر – کوردستان.

جەزا توفیق غالب ،١٩٩٥ گرنگی شوێنی جیوگرافی هەرێمی کوردستانی عیراق / سولەیمانی/ کوردستان.

(GBSR ) )نەوتی کوردستانی عیراق – هەولێر – کوردستان.

سەنتەری لێکۆلێنەوەی دورخایەن/ژمارە/٢٤ ، ٢٦ ، ١٩٩٩/٣٣ سولەیمانی / کوردستان.

ئەو سەرچاوانەی کە بەزمانی عەرەبی چاپکراون

گوڵدێران عەزیز ، نامەی ماجستێر لە زانکۆی سەلاحەدین , کۆلیژی ئابووری، ١٩٩٨، چالاکی بازرگانی لە هەرێمی کوردستانی عیراق (١٩٩٣ – ١٩٩٨ .(زانکۆی سەلاحەالدین – هەولێر – کوردستان ( بۆ مەسەلەی هەندێك ئامارو چالاکی بازرگانی هەرێمی کوردستان هەندێك سوودم لیٚ وەرگرتووە (.

...................................

سەرچاوە چاپ نەکراوەکان ( سەرچاوەکانی ئینتەرنێت:(

کەم وزۆر سوودم لەو سەرچاوانە وەرگرتووە بۆ بە ئەنجامدانی ئەم کتێبەم.

http:/:/ www.kdp.pp.se

http:// www.krg.org

http:// www.kurdish.com

http:// www.kurdistan.Ws/education

http:// www.un.org

http:// www.kdp.ankara.kurdland

http:// www.fas.org/news/iraq

http:// www.krds.net

http:// www.kurdistan–ParLament.org

http://members.aol.Com/krg site

ناونیشانی نووسەر لە فینلەندا:

Writer’s Address:

Khasro Pirbal

Vuoksenk 6 –B-15

15100 Lahti

Finland

Tel:: 00 35850 3204815

Telefax : 00358 3 7807 672

Pirbal@hotmail.com

## هاوپێچەکان

هاوپێچی ژمارە ١ نەخشەکانی بەڕێوەبردنی هەرێمی کوردستانی عیراق.

هاوپێچی ژمارە ٢ کێلگە وبۆڕییە نەوتەکانی هەرێمی کوردستانی عیراق.

هاوپێچی ژمارە ٣ بیرو بۆڕییە نەوتەکانی کوردستانی عیراق.

هاوپێچی ژمارە ٤ بڕیاری نێو دەوڵەتی ژمارە /٩٨٦.((UNSCR-986))

هاوپێچی ژمارە ٥ نەخشەکانی بەڕێوەبردنی عیراق – بەپێی ڕاپۆرتە نێودەولەتییەکانی. (UN)

هاوپێچی ژمارە ٦ ئەلف وبای زمانی کوردی.

هاوپێچی ژمارە ٧ دانیشتوانی کوردستان.

هاوپێچی ژمارە ٨ رامیاری تواندنەوەی کوردوبەعەرەب کردنی کورد لەکوردستانی عیراقدا.

هاوپێچی ژمارە ٩ نەخشەی هەرێمی کوردستانی عیڕاق.

هاوپێچی ژمارە ١٠ حکومەتی هەرێمی کورد لە ساڵی/٢٠٠١.

هاوپێچی ژمارە ١١ بریاری سزا نێودەولەتییەکانی (UN) لەسەر عیراق (بریاری / ٩٨٦ .(

-

-

## ناوەڕۆك

چالاکیەکانی هێنان و هەناردنە دەرەوە لە کوردستانی عیراق

گواستنەوەو ڕێگاوبانی هەرێمی کوردستانی عیراق

ئاستەنگ و تەنگوچەڵەمەکانی گواستنەوە

گیروگرفتی ئابووری

بەشی چوارەم:

ڕێ و شێوازی بازرگانی لە هەرێمی کوردستانی عیراق

کۆبوونەوەی و پەیوەندیبەستنی نێوان بازرگانانی کورد لەگەڵ دەرەوە

بۆنەو یادەوەریەکانی سالآنەی کوردەکان

داب و نەریت و بنەمان و شێوازەکان ( ناونیشان ، ڕوشکاندن , هەندێك داب و نەریتی تری کوردەکان(...

شوێن و ڕۆڵی ئافرەتی کورد

پەیوەندیەکانی بازرگانی لە کوردستاندا

نامە ناردن بۆ کوردستان

تەلەفۆن و فاکسی نێودەولەتی

خزمەتگوزاری ئەنتەرنێت لە کوردستاندا

بەشی پێنجەم:

سەرەنج و پێشنیارەکانی لێکۆڵینەوەکەمان

پووختەو دەرەنجامەکان

# سوپاسنامە

لە دڵەوە سوپاسی بێپانم ئاراستەی خاتوو کارۆل ئۆلێریٚ لە زانکۆی ئەمریکایی لە واشنتۆن ئەکەم کە پێشەکی ئەم کتێبەی بۆ نووسیم.

هەروەها سوپاسی گەرمم بۆ بەرێزان ئیسماعیل خەلیل هەژارکە بە وەرگێڕانی ککێبەکەمەوە ماندوو بوو وە دکتۆر عبداللە ئاگرین و برای گەورەم مامۆستا صباح پیربال و کاك رزگار نامق بۆ هاوکارییان لە ئامادەکردنی ئەم کتێبە.

خسرۆ پیربالٚ

12/9/2002